أبو الأعلى المودودي

# تیۆری سیاسی ئیسلام

وەرگێڕانی

ئامۆژگار بەرزنجی

١٤٢٦ هەولێر ٢٠٠٥

# تیۆری سیاسی ئیسلام

نوسینی

أبوالأعلى المودودي

وەرگێڕانی

ئامۆژگار بەرزنجی

تەفسیر

١٤٢٦ك هەولێر ٢٠٠٥ز

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب بە عارەبی: | النظرية السياسية في الإسلام |
| ناوی نوسەر: | أبو الأعلى المودودي |
| ناوی کتێب بەکوردی: | تیۆری سیاسی ئیسلام |
| ناوی وەرگێڕ: | ئامۆژگار بەرزنجی |
| چاپ و بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر |
| کۆمپیوتەر: | نوسینگەی تەفسیر |
| خەت: | نەوزاد کۆیی |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم ١٤٢٦ک – ٢٠٠٥ز |
| تیراژ: | ٢٠٠٠ دانە |
| ژمارەی سپاردن: | ١١٤ ساڵی ٢٠٠٥ |


تەفسیر
هەولێر- شەقامی دادگا- ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ — ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی وەرگێڕی کوردی

ئەم نامیلکەیەی لە بەردەستاندایە، لە نووسینی مەولانا (أبوالاعلی المودودی) یە، کە لە زانا بەرزەکانی چەرخی چواردەی کۆچی بوو، بەڕای زۆر لە موسڵمانان یەکێك بووە لە نوێکەرەوە(مجدّد)ەکانی ئەو چەرخە، دەیان کتێب و نامیلکەی لە دوای خۆی بە جێ هێشتووە لە پێشەوەی هەمووان تە فسیرە بەناوبانگەکەیەتی  کە ناوی (تفهیم القران) ە . لێرەدا ئەوەی گرنگ بێ بارودۆخی نووسینی ئەم نامیلکەیە ئەویش لە پێشەکی تەرجومە عەرەبیەکەی هاتووە بۆیە ئێمە دووبارەی ناکەینەوە، ئێمە تەرجومە عەرەبیەکەمان وەرگێڕاوەتە سەرکوردی. لەو شوێنانەی کە نووسەر ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی بۆ باسەکان هێناوەتەوە ئەو لە هەندێ شوێن تەنها ئەو بەشەی ئایەتەکەی هێناوەتەوە کە پەیوەندی بە بابەتەکە هەیە، نەك ئایەتەکە هەمووی،بۆیە ئێمە لەو شوێنانەدا سێ خاڵمان (...) داناوە بۆ ئەوەی بزانرێ کە ئایەتەکە تەواو نەبووە. مەسەلە یەکی تریش ئەوەیە کە نووسەر لە ساڵی ١٩٣٩ ئەم نامیلکەی نووسیوە، بۆیە ئەم حکومەت و سەرکردە سیاسییانە باس دەکات کە لە زەمانی خۆیدا ژیاون، لە کاتی خوێندنەوە پێویستە ئاگاداری کات و شوێنی نووسین بکرێت. لە دواییدا لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە ئەم کارەمان لێ قبوول بکات و یارمەتیمان بدات بۆ زیاتر نووسین و وەرگێرانی کتێب و بابەتی بە سوود و بە نرخ بۆ خزمەت کردن بە ئیسلام و وورپا کردنەوە خەڵك.

# پێشەکی وەرگێڕی عەرەبی

ئەم نامیلکەیە سیمینارێك (محـاضرة )بـوو کـە مامۆسـتا سـەید (أبـو الاعلی المودودی) لە شاری لاهور لە ئۆکتۆبەری ١٩٣٩ دای.

ئەم ووتارە لە کاتێکدا گووترا، کە چینی تازە پێگەیەشـتووی رۆشـنبیر لیْ ی تێکەڵ ببوو نەی دەزانی چۆن رێگای راست بدۆزێتەوە لە ململانـێ ی توندی نێوان دووتیۆر،یەکێکیان تیۆری ناسیونالیزمی هیندی لێشاو هێنـەر بـوو کـە کۆنگـرەی نیشـتمانی هینـدی (Indian National Congress) بانگەوازی بۆ دەکرد ، ئەوی تریان تیۆری ناسیونالیزمی ئیسلامی تونـدڕەو بوو کە جیـاوازی نـەدەکرد لـە نێـوان ئیسـلامی راسـتەقینە و ئیسـلامی جوگرافی (ئەگەر دەربڕینەکە تەواو بێـت) کـە ئـەمیش رابطـەی ئیسـلامی (Muslim Leage) بانگەوازی بۆ دەکرد، بۆیە لە ئەنجامی کاریگەری ئەم موحازەرەیە ڕووی راستی تیۆری سیاسـی ئیسـلامی دەرکـەوت و هـەموو لایەك زانییان ئەو ئامانجە پیرۆزە چیە کە ئیسلام خەڵکی بۆ بانگ دەکات، ئەو جیاوازییەیان بۆ ڕوون بووەوە کە لە نێوان تیۆری سیاسـی ئیسـلامی و لە نێوان ئەو دەمارگیرییە نیشتمانی و ناسیونالیسـتە بـێ بناغانـە هەیـە، هەروەها لە بانگکەرانی تیۆرە ناڕەواکانی دژ بە ئیسلام و فەرمایشـتەکانی بە ئاگابوونەوە.

ئەم موحازەرەیە لە ساڵی١٩٣٩ درا، دەیان هەزاران دانـەی بـە زوبـانی ئوردی لیْ کەوتەوە بازاڕەوە، پاشان وەرگێڕرا بۆ زوبانی ئینگلیزی و زۆر لـە زوبانەکانی تری هیندستان. بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٤٦ بە عـەرەبی لـە لاهور لیْ کەوتە بازاڕەوە، بۆیە ناوەندە ئیسلامیەکان لە وڵاتانی عەرەب بە

پەرۆشەوە هەڵیان قۆزتەوە و ئەمەش هانی دان کە هەستن بە وەرگێڕانی ئەم زنجیرە لە نامەکانی بانگەوازی کە مامۆستا مەودوی و دەستەیەك لە هاوەڵانی نووسیبویان. پاشان چاپی دووەم لە ساڵی ١٩٥٠ کەوتە بازاڕاوە، ئا ئەمەش چاپی سێیەمینە لە دیمەشق دێتە چاپ کردن پاش چەند ڕاڤە و پێدا چوونەوەیەك.

محمد عاصم الحداد

# پێشەکی نووسەر

(ئیسلام نیزامێکی دیموکراتیە) دەستەواژەیەکە لەم ڕۆژانە زۆر جار لە لایەن و کۆڕو کۆمەڵە سیاسی و زانستی یەکانەوە بەر گوێمان دەکەوێت. ئەم دەستەواژەیە هەرلە کۆتای چەرخی رابردووەوە بە بەردەوامی دوبارە دەبێتەوە دەیبیستین. ئەوانەی وا دەڵێن و ئەم قسەیان بە سەرزاری خۆیان گرتووە کەسانێکی وایان تێدانیە کە دیراسەیەکی ئیسلامی کردبێ و بە شێوەیەکی زانستییانە لێ ی کۆڵیبێتەوە و تێ ی ڕوانیبێ و هەوڵی دابێ لە بارودۆخی سیاسی تێ بگات، یا خود نە ختێك لە کاروکۆشیشی خۆی تەرخان کردبێ بۆزانینی دوور و نزیکی دیموکراتیەت لە ئیسلام . هەروەها ئاگادار بێت لە چۆنیەتی و شێوەی حوکمی ئیسلامی و جیاوازییەکانی لەگەڵ دیموکراتیەتی ڕۆژئاوایی کە لەم ڕۆژگارەدا لە ئارادایە.

هەر لە بەر ئەمەشە دەبینی هەندێك ( ڕژێمی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا) لە چەند شێوەیەکی دیاری کراودا دەبینێ و ناوی دیموکراتییەتی لێ دێنێ. زۆر بەشیان لەبەر ئەوەی نەخۆشن و بیرو مێشکیان بە جوانی کارناکات دەیانەوەی ئەوەی ئیمڕۆ لە بازاڕی جیهانی شارستانێتی باوە هەمان شت لە ئیسلامەتیشدا هەبێ. بە تایبەتی ئەوەی لە ناو ولاتە دەسەلاتدارەکان باوە کە زاڵن بە سەر زۆربەی ولاتە ئیسلامییەکان. بەم کارەیان، واتێ دەگەن کە خزمەتێکی گەورە بە ئایینی ئیسلام دەکەن.

وەکو بڵێ ی ئیسلام هەر وەکو ئەوان دەیبینن بە هەتیوی لە دایك بووە و بێ کەسە و ناتوانێ بە تەنها بژی بۆیە دەبێ بچێتە ژێر چاودێری

پیاوێکی خاوەن پایە و دەسەڵاتدار و دەست ڕۆیشتوو. یا خود ئەوانە دەترسن لەوەی کە موسڵمانبن سەربەرز نابن و ناو پەیداناکەن و تاکو چەند بنچینەو سەرەتاو ڕژێمێك دەرنەهێنین لە ئایینەکەی خۆیان کە وەکو بنچینەی ئەو ڕژێمە کۆمەڵایەتیانە بێت کە لەم ڕۆژانە لە دنیادا باوی هەیە. یەك لە ئەنجامەکانی ئەم جۆرە بیرکردنەوە نەخۆشە ئەوە بوو کاتێ (کۆمۆنیستی) لە ناو خەڵکدا بڵاو بۆوە تاقمەیەك لە ناو ئێمەی موسڵمانان پەیدا بوون گووتیان خەڵکینە کۆمۆ نیستی چاپێکی نوێ یە لە ئیسلام واتە ئیسلامە دێرینەکەی خۆمانە. کاتێ بیستیان دکتاتۆر دەوردەبینێ هاواریان کرد و گووتیان: ڕژێمی کۆمەڵایەتی ئیسلامی هەمووی لەسەربناغەی دکتاتۆریەت وەستاوە. بە کورتی تیۆری سیاسی ئیسلامی ئیمرۆ بۆتە مەتەڵێك. تێکەڵێکە لە چەند پارچەیەکی دژبەیەك ، هەر کەسێ بیەوێ بە کەیفی خۆی شتی لێ دەتاشێ وبە سودی خۆی بە کاری دێنێ بۆ ئەو شتەی کە باوە . بۆیە ئێستا زۆر پێویستە کە لەم مەسەلەیە ووردببینینەوەو پەردە لەسەر رووی (تیۆری سیاسی ئیسلامی) لابدەین. بە هیوای ئەوەی ئەم کوێرەوەریەی کە سەرتاپا کۆمەڵگای داگرتووە لابچێت و جڵەوی ئەو کەسانە بگیرێت کە لە نەفامی و نەزانی و خۆیانەوە دەڵێن: (ئیسلام هەرگیز ڕژێمێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ کۆمەڵگای ئادەمیزاد نەهێناوە ).

هەروەها ڕووناکی یەك بگەیەنینە ئەوانەی لە تاریکایی ڕێگایان لێ وون بووە و سەریان لێ شێواوە و ڕێگای ڕاستی نادۆزنەوە. لەم ڕۆژگارەدا زۆر پێوستیان بەم ڕۆناکییە هەیە، هەرچەندە خۆشیان هەست بەو پێوستییە ناکەن.

## بنچینەی هەموو تیۆرە ئیسلامیەکان

ئەوەی کە پێویستە پێش هەموو شتێك بیزانین و لێ ی بێ ئاگا نەبین ئەوەیە کە ئیسلام کۆمەڵێ بیروڕای پەرش و بڵاو و کۆمەڵێ ڕێچکۆکەی جیا جیا نیە بۆ ئیش کردن، لەم لاو لەولا بە چەند شتێکی وا کۆکرابێتەوە کە پەیوەندی یان بە یەکترەوە نەبێت. بەڵکو ئیسلام ڕژێمێکی گشتی و بناغە پتەوە لە سەر چەند بنچینەیەکی وورد و ژیرییانە دامەزراوە.جا هەر لە پایەو کوڵەکە زۆرو گرنگەکانی تا لق و پۆپە ووردو بچوکەکانی بە شێوەیەکی ڕێك و ژیرییانە بەم بنچینانە بەستراون. هەر دانانێکی کە بۆ ژیانی ئادەمیزاد دانابێت ، بە هەموو لقەکانی ، ئەوا سەرچاوەو بناوانەکەی لەم بنچینە سەرەکییانەوە دەرهێناوە. هەر لەم بنچینەو بنەڕەتانەوە ژیانی ئیسلامی دێتە کایەوە.هەروەکو لە درەختدا دەبینین چۆن لە تۆوە ڕەگ دروست دەکات، ڕەگیش لق دروست دەکات،لقیش گەڵا دروست دەکات، تاکو درەختەکە بڵند دەبێت. بەڵام لە گەڵ بەرزبوونەوەی لاسکەکەو درێژبوونەوەی دەبینین هەر گەڵایەك بە شێوەیەکی توندو تۆڵ و پتەو لە گەڵ ڕەگەکەیەوە بەندە. بۆیە ئەگەر ویستت لە هەر لقێك لە لقەکانی ژیانی ئیسلامی بگەی و تێگەیشتنێکی ڕاستت هەبێ، بێ گومان دەبێ بگەڕێیتەوە سەر بنچینەکەی . لەم کڵاوڕۆژنەوە نەبێت ناتوانی بۆی بچی، لە ڕاستی و ناوەرۆکەکەی ناگەی تەنیا بە ووردبونەوە لە بنج و بناوانەکانی نەبێت.

## ئەو كارەی كە نێرراوانی خوا رايانپەڕاند

هەموومان دەزانين ( ئيسلام ) ئەو ئەركەيە كــە هــەموو پێغەمبــەرانی خوا پێ ی هەستاون . پەيامێكی تايبەت نەبوو بە پێغەمبەرمان موحەممەد (صلّی الله عليه وسلّم) ، بەڵكو ئەركی هــەموو پێغەمبــەر و نێرراوانــی خوای گەورەبووە. لە ســەردەمە هــەرە كۆنــەكانی مێــژوی ئــادەميزادەوە. ئەمانە هەمويان بانگی خەڵكيان دەكرد بۆ ئيسلام بوون و بە يەك ناسين و پەرستنی خوايەكی تاك و تەنيا. ئەمەش شتێكە خەڵك بــە گشــتی و بــە كورتی دەيزانێ. هەروەكو لە پێشوو گوتمان. بۆيە وا جوانترە لێرەدا زياتر بە درێژی لەم مەســـەلەيە بكۆڵينــەوەو بچينــە بنــج و بنــاوانی، تــاكو بزانــين پێغەمبەرانی خوا مەبەستيان لە خوا بەيەك ناســين و پەرســتنی خوايــەكی تاك و تەنيا چی بوو؟ ئايا مەبەستيان چی بوو لە ( مالَكُمْ مِــنْ إلــهٍ غَــيْرُهُ) واتە ( بێجگە لەو هيچ خوايەكی ترتان نی يــە)، بۆچــی نــەوەكانی پيشــوو هەر كاتێ نێردراوێكيان لە لايەن خواوە بۆ دەهات كە بــانگی دەكــردن بــۆ خوايەكی تاك و تەنيا و دووركەوتنەوە لــە ( الطــاغوت) ئــەوان بــە ڕوويــا دەچــوون و بەربــەرەكانێ يــان دەكــرد؟. ئەگـــەر نێردراوەكـــانيش تەنـــها مەبەستيان لە قســەی ﴿ أعْبُـدُواالله مَـالَكُمْ مِـنْ إلـهٍ غَـيْرُهُ﴾، واتــە (خــوا بپەرستن ئێوە بێجگــە لــەو خــوای ترتــان نــی يــە) ئــەوە بووبێــت كــە لــە پەرستگاكانيدا كڕنوش بۆ خوا ببەن و بەس. بەڵام كاتێ لــە پەرســتگاكاندا هاتنە دەرەوە سەربەخۆ بن لە بە جێهێنانی كاروبارو پێويستيەكانی ژيــانی دنيايان، چييان بوێت بيكەن و كام پاشاو ســەركردەيان بــوێ گــوێ ڕايــەڵی بكەن. بە جۆرێك ئاين نابێ مــافی ئــەوەی هــەبێ خــۆی لــەم شــتانە هــەڵ بقورتێنێ، چونكە دەوری ئەو تەنيا بە دەرچوون لــە پەرســتگا كۆتــای پــێ

دێت. ئەگەر نێردراوانی خوا تەنیا مەبەستیان لە خوا پەرستی ئــەوە بوایــە هەر وەکو خەڵك ئیمرۆ واتــێ دەگــەن... ئەگــەر ئــەوان تــەنیا ئــەوەندەیان ویستبێت، باشە فەرمانڕەواو ئەمیرەکان مافیان بە سەریاندا چ بــوو ؟ ئایــا ئەم پاشاو فەرمانڕەوایانە دەبێ شێت بوو بن بۆیــە ڕێگــە لــە ژێــر دەستە بەستەزمانەکانی خۆیــان دەگــرن لــە بــە جــێ هێنــانی ئــەم ئــەرك و ڕێ و شوونانە، خۆ ئەم ڕێ و شوونانە زیان ناگەیەنێتە بەرژەوەندی ئەوان؟.

کەواتە بابزانین هۆی راستەقینە چی بووە بۆتە نانــەوەی دووبــەرەکی لــە نێوان نێردراوانی خــواو شــوێن کــەوتووەکانیان و ئــەو نەتــەوە لــە ســنوور دەرچوو و ستەمکارانەی تر کە لە ڕێگای خوا لایــان داوە. چونکــە راســتی ئاشکرا نابێت بە تەواوی هەتاکو پەردە لە سەر ئەم راستییە لا نەدەین.

قورئان لە زۆر شــوێندا بــۆ ئێمــەی ڕوون کردۆتــەوە کــە ئــەو هاوبــەش پەیداکەر (مشرك) و کافرانە لە دووبەرەکی دابوون لە گەڵ نێردراوانی خــوا، ئەمەش وەنەبێ لە بەرئەوە بووبێ کە ئەوان باوەڕیــان بــە خــوا نــەبووبێ و بەڵکو ئەوان باوەڕیان هەبوو کە خــوای گــەورە ئاسمــان و زەوی و ئــەوانیش دروست کردووە، هەر ئەوە هەموو کاروباری بوونەوەر جێ بە جێ دەکــات و هەر ئەویشە باران دەبــارێنێت و بــا دەنــێرێنێت وەکومــژدەو بــەزەیی پێــدا هاتنەوە هەر کاتێك بیەوێ، سوڕانی ڕۆژ و مانگیشی بە دەســتەو ئاسمــان و زەوی و هەموو ئەوانەی تێیدایە لە ژێر دەستی ئەودایە.

هەروەکو خوای گەورە دەفــەرموێت ﴿ قُـلْ لِمَـن الأَرْضُ وَ مَـنْ فِيـهَا إِنْ كُنْتُـمْ تَعْلَمُـونَ سَيَقُولُونَ لِلّـهِ قُـلْ مَـنْ رَبُّ السَّمَواتِ السَّبْعِ وَ رَبُّ العَـرْشِ العَظِيمِ، سَيَقُولُونَ لِلّهِ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ. ﴾ (المؤمنون ٨٤-٨٩) واتــە: (بڵــێ، زەوی و کەسانێ کە لە زەویدان هی کێ یە، ئەگــەر دەزانــن ؟ دەڵێــن هــی خوایە، بڵێ: ئەی نایێتەوە بیرتــان، بڵــێ : کــێ یــە پــەروەردەگاری حــەوت

ئاسمانەکان و تەختی گەورە؟ دەڵێن هەمووی هی خوایە ، جاپێ یان بڵێ ئایا لە خوا ناترسن، پێ یان بڵێ کێ یە فەرمانڕەوایی و حکومەتی هەموو شتێکی بە دەستەو بێ پەنایان پەنا دەداو هەرکەسێ دژی ئەو بێ پەنا دەری نی یە ئەگەر دەزانن دەڵێن هی خوان، بڵێ : چۆن ئێوە هەڵدەخەڵتێن؟). ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ لَيَقولُنَّ الله فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ.﴾ (العنكبوت -٦١-٦٣) . واتە: (ئەگەر لێ یان بپرسن کێ ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە و رۆژو مانگی دەستە مۆ کردووە؟ دەڵێن خوا، جا چۆن لەم ڕاستییە لە لادەدرێن).

﴿ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ الله فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ.﴾ (الزخرف - ٧٨) واتە: (ئەگەر لێ یان بپرسی کێ ئەوانی خوڵقاندووە دەڵێن خوا، جا چۆن لە ڕاستی لادەدرێن).

لەمەوە بۆمان دەدردەکەوێت کە هیچ جیاوازی یەك نەبووە لە نێوان نێردراوی خواو خەڵکی لە سەر ئەوەی کە خوا هەیە و ئادەمیزادی دروست کردووە و ئەویش خاوەنیەتی و هەموو شتێکی بە دەستە، واتە ئەم نێردراوانە بۆ ئەوە نە هاتبوون تاکو بانگیان کەن بۆ ئەم باوەڕەی کە خۆیان لە بنەڕەتدا هەیانە ، کەواتە ئەی بۆ چی نێردراون ؟ بۆچی ئەم کێشەیە لە نێوان ئەوان و ئەو نەتەوانەی کە بۆیان نێردراوبوون پەیدابوو؟ قورئانی پیرۆز ئەوە روون دەکاتەوە کە نێردراوانی خوا خەڵکیان بانگ دەکرد بۆ ئەوەی باوەڕبێنن کە ئەوەی ئاسمان و زەوی دروست کردووە هەر ئەوە خواو پەروەردەگاریان، پێویستە بێجگە لەو هیچ خوایەك یا پەروەردگارێك بە ڕاست نەزانن، بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون بۆ ئەوە. تو خوا پێم بڵێ چی بوو وای کرد ئەمان ئەمە قبوڵ بکەن و چ زیانێکی پێ دەبەخشین ؟ بۆ چی نێردراوانی خوا سوور بوون لەسەر ئەوەی کە خوای مەزن هەر خۆی

پەروەردگار و هەر خۆی خوایە. چی بوو وای کرد ئەوانەی پێغەمبەرانیان بۆ نێردراوبوو تەنها بە بیستنی ئەم بانگەوازە لە روویان بوەستن ؟

## خوا ( الله )

هەموومان دەزانین خوا ماناکەی پەرستراوەو پەرستراویش شیاوی پەرستنە، پەرستنیش تەنیا مانای بەجێ هێنانی چەند رێبازو دروشمێك نی یە، بەڵكو ئەو كەسەی بەبەندایەتی دەژی ژیانی هەمووی پەرستنە... خزمەت كردن و چەمانەوە و كڕنوش بردن و چالاكی نواندن و تێكۆشان لە رێگای خواو هەستان بە هەموو كارێك كە خوا فەرمانی پێ داوەو دوور كەوتنەوە لەو شتانەی كە ئەو قەدەغەی كردووەو مل كەچی بۆ هەموو یاسایەك كە ئەو داینابێ و دوژمنایەتی هەموو شتێك كە دژە لە گەڵ فەرمانی ئەو و خۆبەخت كردن و گیان بەخشین لە پێناوی رەزامەندی ئەو... ئەمانە هەموو بە پەرستن دەژمێردرێن ئەمەیە مانای راستی پەرستن .. بەڵكو پەرستن لە راستیدا ئەوەیە كەبەم شێوەیە بیپەرستی.

## پەروەردگار ( الرّبّ )

بەڵام پەروەردگار مانای پەروەردەكەرە ... شتێكی ئاشكرایە پەروەردگار دەبێت گوێ رایەڵی بكرێت ، هەر بەم بۆنەیەشەوە پەروەردگار بە مانای خاوەن و گەورەیەكی گوێ رایەڵی كراو و قسە بیستراو هاتووە. هەروەكو دەوترێت (ربّ المال) واتە خاوەنی ماڵ. (ربّ الدار) واتە خاوەنی خانوو. هەرشتێك مرۆڤ كردبێتی بە رۆزی دەرو پەروەردەكەری خۆی لە هەمان كاتدا و داوای سۆزو بەزەی هاتنەوەی لێ بكرێت و هیوای هێمنی و

پەرەسەندن و پایە بەرزی لیّ بکریّت و ترسی ئەوەی لیّ هەبیّت کە ئەگەر تووڕە بوو و رقی هەستا ئەوا زیانی پیّ دەبەخشیّ و ژیانی لیّ تالّ دەکات، هەروەها بە خاوەن و گەورەی خۆی دەزانی و گویّ رایەڵی دەکرد لەو شتانەی کە فەرمانی پیّ دەداو لە قسەی دەرنەدەچوو، ئەمە لە راستیدا پەروەردەگاریەتی.

## خۆ بە خوا کردنی خەڵکی تر

پاش روون کردنەوەی ماناى ووشەی (خوا) و(پەروەردگار) واتیّ دەگەی کەس هەبیّت لەوانەی خوا دروستی کردووە لە ڕووی مرۆڤ ڕاست بیّتەوەو پیّ ی بڵیّ: من خوای تۆمەو بمپەرستە؟ ئایا بەرد و دار یا گیان لەبەر یا ڕۆژ و مانگ یا هەر ئەستیّرەیەکی ئاسمان شتی وا دەڵیّن؟ نەخیّر ، قەسەم بە خوا هیچ شتیّ لە ڕوی مرۆڤدا هەڵنەستاوە داوای خوایەتی و پەروەردگاریّتی لیّ بکات ، بەڵکو تەنیا مرۆڤە کە ئارەزوی دەسەلات پەیداکردن و خۆبە پەسندزانین وای لیّ کردووە خۆی بکاتە خوا بە سەر مرۆڤی دیکەی وەکو خۆی، فەرمانەکانی خۆی بەسەریاندا بسەلمیّنیّ و بەزۆری مل کەچ و گویّ ڕایەڵی یان بکات بۆ خۆی و بیانکاتە ئامرازیّك بۆجیّ بە جیّ کردنی ئارەزوەکانی.

هیچ شتیّك لە لای مرۆڤ شیرنترو خۆشتر نی یە لەوەی کە خۆی بکاتە خوا، بۆیە دەبینی ئەوەی هەندیّ سامانی دەست کەوتبیّت یا خود نەختیّ زیرەکی و-دیارکەوتنی پیّدرابیّت نەفسی بۆی ڕازاندۆتەوە کە پیّویستە خۆی بە گەورە بزانیّ و سنورە سروشتییەکانی خۆی تیّپەڕیّنیّ وخۆی بەرزکاتەوە

بۆ تەختی خوایەتی و هەموو ئــەو خەڵکـە چەوسـاوە و هـەژارەی کـە لـە دەوروبەری دەژین و ناتوانن لە ڕوویا بوەستن بکاتە بەندەی خۆی.

ئەوانەی دەیانەوێت خۆیـان بگەیەننـە لوتکـە و پۆپـی خوایـەتی و بـە تەمای خوایەتین، لێرەدا دووجۆرن هەریەکەیان ڕێگایەکی جیاواز دەگرێ بـۆ گەیشتن بەم ئامانجە. جۆری یەکەم: ئـەو کەسـەیە کـە زۆر بوێـرە یـا خـود ئامرازو هۆی وای بۆ ڕێککەوتوە کە دەزانێ بەسە بۆ ئەوەی ئارەزووە نـزم و درۆزنەکانی بێ شەرمانە جێ بە جێ بکات. فرعەون نموونەی ئەم جۆرەیـە، چونکـە بـە و سـامانە و موڵکـە زۆرو زەوەنـدەو ئـەو کـەش و فشـەی دەسەڵاتدارێتی کە خوا پێ ی دابوو و بەو هێزو کەرەسەی کـە بـۆ جـەنگ پەیداکردن لە لای هەبوو، هەڵخەڵەتاو هاواری کرد و بـە میسـری یـەکانی گوت: ﴿ أَنا رَبُّكُمُ الأَعْلَى﴾ واتە من خوای هەرە گەورەتانم ، پاشان گووتـی ﴿ مَا عَلِمْتُ لَكُمْ مِنْ إِلهٍ غَيْرِي﴾ واتە: (نەمزانیوە لـەمن زیـاتر خوایـەکی ترتان هەبێت). خوای گەورەش موسای بـۆ ئـەم و قەومەکـەی نـارد تـاکو بانگی بکات بۆ ڕێگای ڕاست و پـێ ی گـوت ﴿ هَـلْ لَـكَ إِلَـى أَنْ تَزَكَّـى وَ أَهْدِيَكَ إِلى رَبِّكَ فَتَخْشَى فَـأَرَاهُ الآيَـةَ الكُبْرَى﴾ واتـە: (حـەز دەکـەی پـاك ببیتەوەو ڕێگات پێ نشان دەم بۆ لای خـوا تـاکو بترسـی، پاشـان نیشـانە هەرەگەورەکەی نیشاندا).

موسا داوای لێ کرد کە دەست لە نەوەی ئیسرائیلی یـەکان هـەڵگری و بەرەڵایان بکات بۆ ئەوەی موسا خۆی قسەیان لەگەڵدا بکات، فیرعـەونیش وەڵامی داوە گوتـی ﴿لَئِـنْ اتَّخَـذْتَ إِلهاً غَـيْرِي لَـأَجْعَلَنَّكَ مِـنَ الْمَسْـجُونِينَ﴾ واتە: (ئەگەر تۆ بێجگە لە من خوایەکی تر بکەیتە خوای خۆت ، زیندانـت دەکەم). هەروەها ئەو پاشایەی (نەمرود) کە لە گەڵ حەزرەتی ئیـبراهیم (سەلامی خوای لە سەربێ) کەوتە کێشمە کێش و قسە. کە خـوای گـەورە

له قورئاندا باسی دەکات و دەفەرموێ ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْراهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِ وَ أُمِيْتُ قَالَ إِبْراهِيمُ فَإِنَّ اللهَ يَأْتِي بَالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ وَاللهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾(البقرة:٢٥٨) واتە: (ئایا نەت ڕوانییە ئەوەی (نمرود) کە لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم دەربارەی پەروەردەگاری کەوتە مشت و مڕ چونکە خوا موڵك و دەسەڵاتی پێدابوو، ئیبراهیم گوتی: پەروەردەگاری من ئەوەیە زیندوو دەکاتەوە و دەمرێنێ، ئەویش گوتی من زیندوو دەکەمەوە و دەمرێنم ( دوو زیندانی هێناو یەکێکیانی ئازاد کردو ئەوی تریانی کوشت) ئیبراهیم گوتی: خوا رۆژ لە خۆرهەڵاتەوە دێنێ تۆ لە خۆرئاواوە بیهێنە، بۆیە ئەم خوا نەناسە حەپەساو هیچی بۆ نەکرا، خوای گەورەش خەڵکی ستەمکارو کافر ڕێگا نیشان نادات). ئایا چ وای لێ کرد تووشی سەرسوڕمان بێت؟ بۆچی یەکسەر واقی وڕماو چاوی زەق بووە؟ چونکە ئەو نکوڵی لە بوونی خوای گەورە نەدەکرد. بەڵکو دەیزانی کە خوا ئەم گەردوونە و کاروباری زەوی و ئاسمانەکانی بەدەستەو هەر بە فەرمانی ئەویش خۆر هەڵدێت و ئاوا دەبێت، ناکوکییەکە لەسەر ئەوە بوو کە کێ پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکانە؟ کێ دەسەڵاتی بەسەر هەموو ئیشێکدا هەیە. بەڵکو کێشەی ئەو لە سەر ئەوە بوو ئایا کێ خاوەنی سەرو ماڵی خەڵکە بە گشتی و بە تایبەتی خەڵکی بابل؟ ئەو نەی دەگوت من خوامە. بەڵکو دەی گوت من خاوەن و بە خێوکەری ئەم خاکە و خەڵکەکەیم؟ ئەمەی نەدەگوت تەنیالە بەر ئەوە نەبێت کە خۆی خاوەنی گیانی خەڵك بوو و جڵەوی پاشایەتی و سامانی بە دەست بوو. بە کەیف و ئارەزووی خۆی دەجوڵایەوە. هەرکاتێك بیویستایە بە قامچی خەڵکی ڕادەپێچاو سەرکوتی دەکردن و دەیدانە پێش خۆی و لە

خۆی ڕادەبینی کە کێ ی بیەوێ لە هاونیشتمانیان پەل بداو یـا لـە بـەندی رزگاری بکات. هەستی دەکرد کە ووتەکانی ئەو وەك فـەرمان وایـە کـەس ناتوانێ بەرپەچی بداتەوە و بەربەرەکانێ ی بکاو یا پێی بڵێ پشـتی چـاوت برۆیە یا پات خوار داناوە یاخود بە هیچ جۆرێك رەخنەی لیٚ بگـیرێ. هـەر بۆیەش داوای لە حەزرەتی ئیبراهیم ( سەلامی خوای لە سەر بـێ) دەکـرد تا دان بە پەروەردگاری ئەو بێنێ و مل کەچ بێ بـۆی و بیپەرسـتێ وەکـو چۆن خەڵك دەیپەرستن ، بەڵام ئیبراهیم پیٚ ی ووت من کەس بە خوای خـۆم نـازانم تـەنیا پـەروەردگاری زەوی و ئاسمانـەکان نـەبێت هــەر ئەویشــە کەپەروەردگاری هەموو جیهانە، تەنها ئەو دەپەرستم ، رۆژیش بە هەڵـهاتن و ئاوابوونی هەرئەو دەپەرستێ . بۆیە سەرسام بوو و داما، چونکە نـەیزانی چۆن لەگەڵ پیاوێکی وادا بگونجیٚ کە بەڵگـەی بـە هـێزی هـەبێت و لیٚ ی بباتەوە.

ئەو پەرستن و بەندایەتیەی کە فیرعەون و نـەمرود خـەڵکیان بـۆ بـانگ دەکرد ، هەر بەوان نەبەسـتراوەتەوە، بـەڵکو دەبینـین لـە هـەموو کـات و شوینێکدا سەرکردەکان داوای ئەم خوایەتییەیان بۆ خۆیان کردووە.

هەروەکو لە وڵاتی فارس پاشاکانیان بە ووشەی (خدا) یا (خداوند) واتـە اللّه دەدواند. هـەروەها بنەماڵـە فـەرمانڕەواکانی هیندسـتان ڕەچەڵـەك و بنەچەی خۆیان دەگەڕاندەوە سەر خواکانی (دیوتا) تا ئێستاش دوو بنەماڵە هەن بە (سورج بنسی) و (چندر بنسی) دەناسرێن واتە نـەوەی رۆژو نـەوەی مـانگ. هیندی یەکانیش ئەگەر لەگەڵ پاشاکانیان بکەوتبوونایـە قسـە بـە (ئان داتا) دەیاندواندن واتە بە ڕۆزیدەر (رزّاق) و کرنوشیان بۆ دەبردن.

هەروەها ئەوان وایان دەزانی ئەو پاشـایانە (پڕمیشـور)ن واتـە پاشـان. پاشاکانیش بە خۆیان دەعوای ئەوەیان نەدەکرد. لەسەدەکانی ڕابردووەوە تـا

ئێستاش خەڵك هەن لە سەر ئەمە دەڕۆن لە زۆر وڵاتانی جیهاندا، پاشاکان بە ووشەی لەم شێوەیە بانگ دەکرێن. لەو وڵاتانەی کە ئەم ووشانەی ڕاستەوخۆ تێدا بەکار نایێت، دەبینین ئەم گیانە و نەفسیەتە لە ناو دڵ و دەروونیاندا دەجولێتەوە، چونکە گرنگ نی یە لەم جۆرە داوایەی خۆکردنە خوا (دعوی الألوهیة) فەرمانڕەواکە بە ئاشکرا بانگ بکات من خواو پەروەردگاری ئێوەم.

نەخێر ، بەڵکو هەر کەسێك توانای بەسەرگیان ولەشی خەڵکی هەبێ و دەسەڵاتی بەسەر خوێن وماڵیاندا بشکێت، چۆن دەیەوێت، بە قامچی دەسەڵاتداری بێ سنووری خۆی و بەزەبری ئەو گەورەییە ملهوڕییەی هەیەتی لێ یان بخوڕێت، کە خۆی بە ناڕەوایی و بە خورتی بەسەر خەڵکیدا سەپاندوە وەکو فیرعەون و نەمرود، ئەوا لە راستیدا داوای خوایەتی و پەروەردگارێتی دەکات. هەر چەندە بەزار ئاشکرای نەکات. ئەو کەسانەش کە بۆ زەبرو زۆری ئەوانە مل کەچی دەکەن و سەریان بۆ دادەنەوێنن و فەرمانەکانیان بەجێ دەگەیەنن، ئەوانە لە ڕاستیدا دان بە خوایەتی و پەروەردگاری ئەوان دێنن و هەرچەندە بەزوبان دەری نەبڕن.

بەگشتی بەشێك هەن بە ئاشکرا بانگاشەی خوایەتی و پەروەردگارێتی دەکەن. هەندێکی تر هەن زەبرو هێزی ماددییان بۆ ڕێك نەکەوتووە بۆ ئەوەی ئەم بانگاشە ترسناکە بکەن و خەڵك بۆ خۆیان مل کەچ بکەن، بۆیە ڕێگایەکی تر دەگرنەبەر، خۆیان بە سیحرو تەڵەکە بازی چەکدار دەکەن، تاکو دڵ و دەرونی خەڵك بۆ خۆیان رابکێشن. بۆیە دەچن بۆ گیانێك (خواکانی دیوتا) یا بتێك یا گۆڕێك یا خود ئەستێرەیەك یا شتێکی تر بێجگە لەمانە دەکەن بە خودا و لە ناو خەڵك بڵاوی دەکەنەوە ئەمە خواتانەو توانای ئەوەی هەیە سودو زیانتان پێ ببەخشێت. هەر ئەوە

کاروبارتان بۆ جیّ بە جیّ دەکات و هەردەم پیشتیوانتانە و بەسەردوژمنان سەرتان دەخات و دەست بە باڵتانەوە دەگریّت. بەلاّم کەس نازانیّ چۆن ڕازی بکاو بەخشینی بەسەرتاندا ببارێنێت بێجگە لە ئێمە.

دەئێوەش بمانکەنە پەیژەیەك و وەسیلەیەك و ڕێزمان لیّ بگرن و ئەوەی هەتانە لە گیان و سامان و ناموس بیخەنە بەردەستی ئێمە.

زۆر کەسی گێل و نەزان دەکەوێتە ئەم جۆرە داوانەی کە بۆیان دانراوە. بەم شێوەیە بەهۆی ئەم خوا دەستکردو درۆینانە کۆڵەکەکانی خوایەتی ئەم دەجال گەرانە لەجێوری پەرستگاکان و خزمەت کارەکان خۆی رادەگرێت، هەروەهادەست بەسەر چارەنووسی خەڵکی ڕەش و رووت دادەگریّ و چۆن ئارەزووە پیس و نزمەکانیان بیەویّ و حەز بکات. هەر لەم تاقمەش هەندێکیشیان لەسەر کەهانەت و ئەستێرەناسی و فاڵچێتی و نووسینی نوشتەك و کشتەك بەڕێوە دەچن. هەندێکیشیان لەوانە دان بەوە دادەنێن کە ئەوانیش بەندەی خوان وەکو خەڵك بەلاّم وا دەزانن کە ئەوان پەیوەندی و واسیتەن لە نێوان خواو بەندەکانی، خوای گەورە ناکریّ کەس بیگاتیّ بیّ واسیتە و پەیوەندی ئەوان. هەرشتێك کە خەڵك بیکەن لەریّ و رەسمی بەندایەتی و عبودیەت دەبیّ لە ڕێگەی ئەوانەوە بەجیّ بهێندریّ، هەروەها ریّ و رەسمی ژیانیان هەمووی دەبێت لە سەر دەستی ئەوانە بێت و لە ڕێگەی ئەوانەوە بێت.

تێیاندا هەیە تەنیا بەخۆیان کتێبی خوا لێك دەدەنەوەو تەنیا خۆیان بە هەڵگری راستەقینەی کتێبی خوا دەزانن. بۆیە خەڵك لە زانینی ئەم کتێبە بێبەش دەکەن و رژێم و یاسای خۆیانیان بەسەردا دەڕوێنن و ئەوەی بیانەویّ حەلاّلی دەکەن و ئەوەی نەشیانەویّ حەڕامی دەکەن. گوایە خوا بەزاری ئەوان قسەدەکات، بەم چەشنە فێلاّنە خەڵك ناچار دەکەن شوێنیان بکەون

و بیانکەن بە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خوای گەورە.ئەمەش سەرچاوەی (براهمی) و (بابەوی) یە کە ئێستا باوە بەشێوەیەکی جۆراو جۆر و بە ناوی جیا جیا .ئەمەیە کە زۆر لە گەل و هۆزو بنەماڵەیەك کردوویانە بە تاکە داردەستێك بۆسەپاندنی سەروەری خۆیان بە سەر خەڵکدا.

ئا بەم شێوە ئەگەر لەم روانگەوە سەرنجی کۆمەڵگای ئادەمیزادی بدەیت دەبینی سەرچاوەی شەڕ و خراپەکاری لە هەموو شتێکدا ئەوەیەکە( هەندێك خۆیان کردووەتە خوای هەندێکی تر) . جا ئەمە ڕاستەوخۆ بێت یا بەڕێگەی ترەوە . ئەمەیە ئەم تیۆرە بەدبینە کە خراپەکاری لەوەوە پەیدابووە.هەر ئەمیشە کە بۆتە سەرچاوەی خراپەکاری و لە هەموو شوێنێکدا خراپەی لێ هەڵدەقوڵێ.کەچی خوای گەورە بە سروشتی ئادەمیزاد زانایە و هیچ شتێك لە خراپەو هەواو ئارەزووەکانی ئینسانی لێ شاراوە نییە.

تاقی کردنەوەکانی مێژوو بە درێژایی چاخەکانی رابردوو ئەوەی بۆ ئێمە سەلماندووە و روونی کردۆتەوە کە مرۆڤ ناتوانێت ژیان بباتە سەر تاکو خوایەك و پەروەردگارێك بۆ خۆی پەیدا نەکات.

ئادەمیزادەکانیش ناتوانن هەمیشە بێ خواو پەروەردگار بن، ئەگەرکەسێکیش رازی نەبێ خوای گەورە بکاتە خواو پەروەردگاری خۆی بێگومان ئەو کاتە ژمارەیەکی زۆر لە خواو پەروەردگاری نارەواو بە درۆ بەسەریدا زاڵ دەبن.

❊❊❊

ئەگەر لەوانەی باسم کرد گومانت هەیە؟ بڕوانە پارتی کۆمۆنیستی روسیا، ئایا ئەوانەی جڵەوی مەکتەبی سیاسییان (Political Bureau) بە

دەستە، نەبوونەتە خواو پەروەردگاری خەڵکی ئەم وڵاتە؟ ئایا (ستالین) کە گەورە و پاڵەوانەکەیانە خوای هەرە گەورەیان نی یە؟ هیچ گوند و کێڵگــە (Farm) یێك ماوە کە وێنەی خوای ڕووس و لــە سـنور دەرچووەکـەی تێـدا نەبێت؟ خۆشت زانیت چۆن رژێمی کۆمۆنیستی، لەو پارچە زەوییەی کە لــە پۆلۆنیا داگیریان کرد، دەست پێکراو ســەپێنرا؟ بـەڵێ هــەر لـە سـەرەتاوە هــەزاران دانــەیان لــە وێنــەی (ســتالین) بـۆ نـاردن لـە هـەموو گوندێـك بڵاوکرایەوە، بۆ ئەوەی یەکەم جارو پێــش هــەموو شـتێك خـوای مــەزن و پەروەردگاری گەورەیان بناسن، !! تاکو بێنە ناو ئایینی بەلشەفی !!، بۆچــی مرۆڤێکی وەك ئێمە ئاسایی کە لە نێر ومێیــەك پــەیدابووە ئــەو هــەموو گرنگی و بایەخ پێ دانەی بدرێتێ؟ لەبەر چ هیچ هۆیەك، پیاوێك بــا بلێـین نوێنەری کۆمەڵگایەکیش بێت (Community) ، خۆی بەسەر دڵ و گیــانی ملیۆنەها کەس زاڵ بکات و دابسەپێنێ. بەڕادەیەك کە زەبروزەنگ و فیز و لووت بەرزییەکەی کاربکاتە دەمارو خوێنیان و دڵیان بێنێتە لەرزین؟ ئایــا ئەمە یەك لە شێوەکانی خۆسەپاندنی بەتــەنیایی نییــە بــە ســەر خـەڵکدا؟ لێرەدا دەزانین کە چۆن ئادەمیزاد هەندێکیان دەبنە خوای هەندێکی تریــان. هەر بەم شێوەیەشە لە هەموو سەردەمێکدا ڕژێمی فیرعەونی و نــەمروودی و مــەزاری و قەیســەری دێتــە کایــەوە و ڕەگ دادەکوتــێ ، هــەروەها لــە ئیتالیاشدا ئەمە هەیە کە مەجلیسی فاشی گەورە، کۆمەڵگای خوایەکان و یانەکەیانە (مۆسۆلینی)یش خوای هەرە گەورەیانە، هەروەها ئــەم شــتە لــە ئەڵمانیاشدا هەیــە، کــە ســەرکردەکانی پــارتی نــازی وەکــو خوایــەکانیانن (هیتلەر) یش خوای هەرە گەورەیانە، واتێ نەگەی ئینگەلتــەرەو ئــەمریکا کە دیموکراتیەتیان (Democracy) بەزار گرتووە، لــە و جــۆرە خوایانــەیان تێدا نییە، ئایا نابینی بەڕێوەبەری بانکی گەورەی بەریتــانیــا(Bank of

England ) و ژمارەیەك لە چینە بەرزەكانی خاوەن دارایی و سیاسەتمەدارەكانی بەڕێوەی دەبەن، چۆن خەڵكیان بۆ ئارەزووی خۆیان مل كەچ كردووە؟

هەروەها ئەمریكا كە تێیدا پارەداران بە پەنجە دەژمێردرێن دەرامەت و دارایی یان خستۆتە ژێر دەستی خۆیان و دەستیان بە سەر خوێن و ماڵی خەڵكی داگرتووە، وای لیّ هاتووە بە هۆی ئەو داراییەی كە هەیانە ببنە خوای ئەم میللەتە.

بەگشتی، بە هەرلایەك چاوبگێڕی، دەبینی كە كۆمەڵیّ خۆی كردۆتە خوای نەتەوەیەكی تر یان چینیّ دەسەڵاتی خۆی بەسەر چەند چینێكی تردا سەپاندووە، یا پارتێكی سیاسی هاتۆتە سەر شوێن و پایەی خوایەتی و پەروەردگارێتی بە تەنیا بۆ خۆی رەخساندووە. یا دەبینی ملهورێك (دكتاتۆرێك) پڕ بەدەنگ بانگ دەكات جاچ بە قسە یا بە كردووە (مَا عَلِمْتُ لَكُمْ مِنْ إِلهٍ غَيْرِي) واتە: (نەم زانیوەلە غەیری من زیاتر خوای ترتان هەبێت)، كەواتە لە هیچ پارچەیەكی رووی زەوی ئادەمیزاد بیّ خوا نەماونەتەوە. جا سەیركە دەبینی لە ئەنجامی خۆ بەخواكردنی خەڵك بۆ سەر خەڵكی تر چ دەبێت و چ چارەنووسێكی ڕەش و خراپەكاری لیّ دەكەوێتەوە؟ نمونەی ئەمەش وایە كە پیاوێكی گەمژەو گێل ببێتە سەرۆكی پۆلیس یا خود نەفامێكی نەخوێندەوار ببێتە سەرۆكی وەزیران، گومان لەوەدا نییە كە ئارەزووی خۆ بە خواكردن(ألوهية) لە سروشتی دایە مرۆڤ لە سنووری خۆی دێنێتە دەرەوە و ئەگەر ئەمەشی پیّ نەكرد، مرۆڤ لەسەر هاوسەنگی بیری خۆی مایەوە، ئایا ئادەمیزاد ئەو زانیارییە فراوان و لە بن نەهاتووەو ئەو دادپەروەری و خۆ گرتن و زوهد كردن لە چاوتیّ بڕینی شتی دنیاییەی هەیە كە بۆ خوایەتی دەست بدات ؟ بۆیە دەبینین لە هەر

شوێنێك خۆ بكردنه خوای خەڵك بۆ سەر خەڵكی تر رووی دابێت ئەوا لەو شوێنەدا جەوروستەم و چەوساندنەوە و لووت بەرزی لە سەر زەوی خوا بە ناهەق تێدا بڵاوبۆتەوە. ئەو سەربەخۆییە سروشتیەی کە ئادەمیزاد هەیبووە، لیٚ ی سەندووەو سروشتە خۆڕسك و زگماكییەكانی وخاسیەتە بیروباوەڕییەكانی بە جۆرەها كۆت و زنجیر بەندكردووەو رێگەی لە پەرەپێدان و پەرەسەندنی تەواوی كەسایەتی مرۆڤایەتی گرتووە، هەروەكو پێغەمبەر(صلّى الله عليه و سلم) فەرموویەتی: (قال الله عزّ و جلّ إني خلقتُ عبادي حُنفاْءَ فجاْءَتهمُ الشياطينُ فاجتالتـهمْ مـنْ دينـهم و حَرَّمـتْ عليهِمْ ما أحللتُ لهمْ) صحيح مسلم[1]. واتە: خوای گەورە دەفەرموێ: من بەندەكانی خۆم لەسەر خواپەرستی خولقاندووە، پاشان شەیتانەكان هاتن و لە رێ ی دینەكەیان لادان ئەوەی من بۆم حەلال كردوون ئەوان حەرامی دەكەن. بەم پێ یە ڕوون دەبێتەوە كەوا خۆ بە خواكردنی خەڵك بۆ سەر خەڵكی تر، سەرچاوەی ئەو هەموو نەگبەتی و بەدبەختی و كاول كارییە، هەروەها سەرچاوەی ئەو هەموو تەنگانەو دەردەسەری و دڵ تەنگی و ناخۆشیەكە كە ئادەمیزاد تووشی بووە، ئەو نەخۆشییەیە ڕەوشتی ئادەمیزاد و گیان پاكی و هێزی زانیاری و بیربیانی تێكداوە. شارستانێتی مرۆڤ و ژیانی كۆمەڵایەتی و رامیاری و بژێوییەكەی داخواردوونەو بە ووشەیەكی تر ئەو نەخۆشییە یە مرۆڤایەتی ئادەمیزادی داخواردووە. لەسەردەمە هەرە كۆنەكانی مێژووی ئادەمیزادەوە و بەردەوام خەریكی داخواردنێتی تا ئەم چەرخەی ئێستامان:- (ئەم نەخۆشیەش هیچ دەرمانێكی نییە، تەنیا ئەوە نەبێت كە مرۆڤ هەستێت و نارەزای خۆی

---

[1] - صحيح مسلم، مشكاة المصابيح: باب الانذار

بەرامبەر بە هەموو تاغوتەکانی دەربېڕێت و باوەڕی خۆی دەرهەق بەتاق و تەنیایی خوای گەورە و بە توانا دەربخات، هەر ئەویش تایبەتمەند بکات بۆ خوایەتی و پەروەردگارێتی).

ئەمە تاکە ڕێگایە بۆ ڕزگار بوونی مرۆڤ لە چەنگ و چەپۆکی گورگە ئادەمییەکان و چەتەو ڕێگرەکانی ڕێگاو بان، هەروەها لە چنگ ئەو هەموو تاغوت و خوایە درۆزنانە دەرباز نابێت تەنیا بە باوەڕهێنان بە خوای گەورە و بە هێز و خاوەنی سوپاس کردن نەبێت.

## ئەرکی راستەقینەی پێغەمبەران

چاکەکاری[1] راستەقینە ئەمەیە کە لەسەر دەستی پێغەمبەران لە ناو کۆمەڵگای ئادەمیزادا هاتە دی. ئەمەیە ئەو تیۆرە چاك و شیاوەی کە خوای گەورە پێغەمبەرانی پێ ڕەوانە کرد.

پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ، هاتبوون بۆ شکاندنی ئەو هەموو کۆت و زنجیرانەی کە ئادەمیزاد بەند دەکات، ئەو کۆت و زنجیرانەی کە ئادەمیزاد دەکەنە بەندەی ئەم خوا درۆزنانە و ئەو خوێنمژە ستەمکارانە... نێردرابوون تاکو ئەو کەسانە بێننەوە سەر ڕێ کە لە سنووری خۆیان تێ پەڕینەو دڵیان نەرم کەنەوە تاکو بە خۆشی و کامەرانی لەو سنورانەی کە خوا بۆی داناون بژین.

دەستی ئەو کەسانە بگرن کە زوڵم و ستەم لە خەڵکی وەك خۆیان دەکەن و دەیانخەنە ژێر نیری چەوسانەوەو زەحمەت کێشان و ئاستیان بەرز بکەنەوە، ئەمەش بە کۆکردنەوەیان لە ژێر یەك قسەو لە ژێر یاساو ڕژێمێکی

---

[1] چاکەکاری: إصلاح.

دادپەروەر بۆ ژیان، بە جۆرێك كە تێیدا كەس نەبێتە بەندەی كەس، بەڵكو هەموویان بەندەی یەك خوا بن. هەموو پێغەمبەرانی خوا كە بۆ ئادەمیزاد نێردرابوون هەر لە حەزرەتی ئادەمەوە تا پێغەمبەری خۆمان موحەممەد (صلّی الله علیه وسلم) یەك پەیامیان پێ بوو بۆ هەموو مرۆڤایەتی، ئەویش بە كورتی هەروەكو لەسەر زوبانی وەحی هاتووە ئەوە بوو:- ﴿يا قَوْمِ اعْبُدُوا اللهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلهٍ غَيْرُهُ ...﴾ واتە (ئەی قەومەكەم تەنها خوا بپەرستن بێجگە لەو خوای ترتان نییە).

ئەمە هاوار و بانگی هەموو نێردراو و پێغەمبەرەكان بوو. ئەمە بوو ئەو قسەیەی كە (نوح) گوتی، ئەوەی (هود) هێنای و ئەوەی صالح و شعیب سەلامی خوایان لەسەر بێ هەموو داوایان بۆ دەكرد. هەر ئەمەش بووە كە پێغەمبەری خۆشەویستمان صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێ بانگی بۆ دەكرد، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێ:- ﴿إِنَّمَا أَنَا مُنْذِرٌ وَمَا مِنْ إِلهٍ إِلاّ اللهُ الوَاحِدُ القَهَّارُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا العَزِيزُ الغَفَّارُ﴾. (ص٦٥-٦٦). واتە: (من تەنها ترسێنەرێكم و هیچ خوایەكی تر نییە. بێجگە لە خوای تاك و تەنیا و كە هەموو شتێك لە ژێر دەستی ئەوە، پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەكانە و ئەوەی لە نێوانیاندایە، ئەو خوایەی خاوەنی بەرزی پڕ بەتواناو لێ بوردنە).

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللهُ الذي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى العَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلا لَهُ الخَلْقُ وَ الأَمْرُ تَبَارَكَ اللهُ رَبُّ العَالَمِينَ﴾. (الأعراف- ٥٤).

واتە: (بەراستی پەروەردگاری ئێوە ئەو خوایەیە كە ئاسمانەكان و زەوی لە شەش ڕۆژدا خەلق كردووە، پاشان لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دامەزرا، بە پەردەی تاریكی شەو ڕۆژ دادەپۆشێ. شەو بە دوای ڕۆژدا، بەلەز و بێ

ماندوو بوون دەکەوێت، ڕۆژو مانگ و ئەستێرەکان دەستەمۆی فەرمانی ئەون، ئاگاداربن بەدی هێنان و فەرمان هەر بۆ ئەوە، پڕ بەرەکەت بێ پەروەردگاری جیهانیان).

﴿ذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمْ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴾ (الأنعام- ١٠٤). واتە: (ئەوەیە خواو پەروەردگارتان کەس نییە شایستەی پەرستن بێت بێجگە لەو، بەدی هێنەری هەموو شتە، جا کەوایە بیپەرستن، هەر ئەویشە پارێزەرو تەگبیرکەری هەموو شت).

﴿وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ...﴾ (البيّنة -٥). واتە: (بەوان فەرمان نەدرا بوو تەنیا ئەوە نەبێت کە خوا بپەرستن بە پاکی لە خوا پەرستندا).

﴿تَعَالَوا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَ بَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللّهِ...﴾ (آل عمران- ٦٤). واتە: (وەرن بۆ سەر واژەیەك (ووشەیەك) کە لە نێوان هەموومان‌دا یەکسانە، ئەویش ئەوەیە کە بێجگە لە خوا کەسی تر نەپەرستین و هیچ شتێك نەکەینە هاوبەشی...).

ئا ئەمە ئەو دەنگە (نداء) خوایی‌یە بوو کە بیر و مێشکی خەڵکی بزواندو ئەو ووزەو هێزە ژیری و ماددییانەی کە ئادەمیزاد هەیان بوو بەڕەڵلا کرد، لە چەنگ ئەو هەموو کۆت و زنجیرانەی بەندایەتی کە لە ژێریدا دەیان نالاند. ئەو زەحمەتی و بارگرانییەی لەسەرشان و ئەستۆیان بوو لابرد. ئەم راستییە دەستورێك بوو بۆ ئازادی راستەقینەی مرۆڤ (ئینسان).

بەم شێوەیە خوای گەورە سوپاسی پێغەمبەر (صلّی الله علیه وسلم) دەکات لە قورئاندا و ڕادەگەیەنێ ﴿وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلالَ الَّتِي

كانَتْ عَلَيْهِمْ ...﴾ (الأعراف- ١٥٧). واته: (ئەو كۆت و زنجیرانەیان لەسەر لا دەبات کە لەسەریان بوو).

## بنەما سەرەکییەکەی تیۆری سیاسی لە ئیسلامدا

ئەو بیروباوەڕەی کە ڕوونمان کردەوە، ناوەڕۆکی ئەم ڕژێمە و بنج و بناوان و تەوەرەیەتی کە لە دەوریدا دەسوڕێتەوە، ئەو بناغەیە کە ئەستونەکانی تیۆری رامیاری لە ئیسلامدا لەسەری وەستاوە، ئەویش ئەوەیە کە دەبێت دەسەڵات (Power) و فەرمان دان و یاسادانان لە چەنگ ئادەمیزاد دەربهێنرێت جا ئادەمیزاد ئەمەی بە تەنیا لە دەست بێت یا بەدەست کۆمەڵێك ئادەمیزاد بێت، ڕێگە بە هیچ یەکێکیان نەدرێت، فەرمان دان و یاسا دانان لە چەنگ ئادەمیزاد دەربهێنرێت، جا ئادەمیزاد ئەمەی بە تەنیا لە دەست بێت یا بەدەست کۆمەڵێك ئادەمیزاد بێت، ڕێگە بە هیچ یەکێکیان نەدرێت، فەرمان بەسەر ئەوی تری وەکو خۆی بسەپێنێ و ئەوانیش گوێ ڕایەڵی بکەن ، یاخود یاسایەکیان بۆ دابنێت ئەوانیش مل کەچ بن بۆی و شوێنی بکەون، چونکە ئەم کارە تەنیا بەدەست خوایە، هیچ کەس تێیدا بەشداری ناکات، هەروەکو خۆی دەفەرمویٚ:

﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ أَمَرَ أَنْ لا تَعْبُدُوا إِلا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ...﴾ (یوسف- ٤٠) واته: (حوکم دانان هەر بۆ خوایە فەرمانی داوە کە بێجگە لەو کەسی تر نەپەرستن ئەمەیە ئاینی ڕاستەقینە).

﴿يَقُولُونَ هَلْ لَنَا مِنَ الأَمْرِ مِنْ شَيْءٍ قُلْ إِنَّ الأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ...﴾. (آل عمران- ١٥٤). واته (ئەوان دەڵێن لەم کارە کاری دەرچوون بۆ شەڕو سەرکەوتن، هیچمان بەدەستە، تۆش پێیان بڵێ کار هەر بەدەست خودایە).

﴿وَلاتَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَذا حَلالٌ وَهَذا حَرَامٌ... ﴾ (النّحل- ١١٦٤). واته: (بەدرۆ زمان و نەگەڕێ و بلێن ئەوە حەلاڵە و ئەوە حەڕامە... ).

﴿ .وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (المائدة- ٤٥) واتە: (هەر کەسێك بەوەی خوا ناردوویەتی حوکم نەکا ئەوانە زاڵم و ستەمکارن).

ئەم ئایەتانە بەئاشکرا ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە دادوەری[1] (حاکمیە) (sovereignty) دەبێت هەر بۆ خوا بێت و یاسا دانانیش بە دەستی ئەو بێت. هیچ کەسێك هەتاکو- پێغەمبەریش بێت بۆی نیە، فەرمان بدات و نەهی بکات بێ ئەوەی دەسەلات و ڕێگای لە خواوە وەرگرتبێت، پێغەمبەر تەنیا دوای ئەو شتە دەکەوێت کە خوا بۆی دەنێرێت ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ﴾ واتە: (من تەنیا پەیرەوی ئەوە دەکەم کە بۆم وەحی کراوە)، خوای گەورەش بۆیە گوێ ڕایەڵی پێغەمبەری لەسەر ئێمە پێویست کردووە چونکە پێغەمبەر تەنیا فەرمانی خوایی مان بۆ دێنێت. خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللهِ...﴾ (النّساء- ٦٤).

واتە: (هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگەر تەنیا بۆ ئەوەی گوێ ڕایەڵی بکرێت بە فەرمانی خوا).

﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ... ﴾ ﴿الأنعام- ٨٩﴾ واتە: (ئەوانەن کە ئێمە کتێبی خواو و زانیاری و پێغەمبەرایەتیمان پێداون).

---

[1] دادوەری: سەروەری = سیادة.

﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُؤْتِيَهُ اللهُ الكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا عِبَاداً لِي مِنْ دُونِ اللهِ وَلَكِنْ كُونُوا رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنْتُمْ تُعَلِّمُونَ الكِتَابَ وَبِمَا كُنْتُمْ تَدْرُسُونَ...﴾ (آل عمران- ٧٩) واته: (بۆ هیچ بەشەرێك شیاو نییە كە خوا كتێب و حكیمەت (زانست) و پێغەمبەرایەتی بداتێ لە دواییدا بە خەڵك بڵێ: من بپەرستن نەك خوا، بەڵكو دەڵێ خەڵكێكی خوایی بن بەو جۆرەی كە كتێبی خوا فێری خەڵك دەكەن و دەرس دەخوێنن).

خاسیەتە سەرەتاییەكانی دەوڵەتی ئیسلامی (Islamic state) كە لەم ئایاتانەی خوارەوە دەردەكەوێت سێ شتە:

١- هیچ تاكێك و بنەماڵەیەك یا چینێك یا پارتێك یا كۆمەڵەیەك یا هەموو دانیشتوانی دەوڵەت، نابێت بەش (نصیب) یان هەبێت لە داوەری(حاكمیەت) چونكە داوەری راستەقینە تەنیا خوا خۆیەتی، دەستەلاتداریەتی راستەقینەش تایبەتە بە زاتی گەورەی خۆی، ئەوانی تر كە لەسەر ئەم گێتی (زەمینە) یە دەژین هەموویان بەخێوكراوو چاودێری كراون لە ژێر دەسەلاتە مەزنەكەی ئەودا، ئەوەی لەسەریانە ئەوەیە كە دەبێت تەنیا بە دوای فەرمانەكانی خوا بكەون.

٢- دەربارەی یاسا دانان بێجگە لە خوا كەس هیچی بەدەست نییە، موسوڵمانەكانیش هەموویان ناتوانن یاسایەك دابڕێژن، ناشتوانن شتێك لەو یاسایە بگۆڕن، كە خوا بۆی دارێژتبن.

٣- دەوڵەتی ئیسلامی بناغەكەی دانامەزرێت تەنیا لەسەر ئەو یاسا دارێژراوە نەبێت كە پێغەمبەر هێناویەتی، هەر چەند باروودۆخ و ئەو حكومەت (Governments) انە بگۆڕین كە جڵەوی ئەم دەوڵەت

(state)ەیان بە دەستە، ئەم دەوڵەتەش شایستەی ئەوە نییە کە گوێ رایەڵی بکرێت، تەنیا لەبەر ئەوە نەبێت کە ئەم بە پێی ئەو شتەی خوا ناردوویەتی فەرمانڕەوایی دەکات، فەرمانی خوا لە ناو خەڵك جێبەجێ دەکات. لێرەدا حکومەتەکان شەرعیەت و ڕەوای خۆیان وەردەگرن.

## چۆنیەتی دەوڵەتی ئیسلامی

ئەگەر بۆ یەکەم جار سەرنج بدەیتە ئەو خاسیەتانەی کە باسمان کرد، دەبینی ئەمە ڕژێمێکی (دیموکراتی) (Democracy) نییە، چونکە دیموکراسی بریتییە لە رژێمێك بۆ فەرمانڕەوایی کە دەسەڵاتداری هەمووی بۆ گەل بێت، گۆڕین و گۆڕینەوەی یاساکانیش دەبێت تەنیا بە پێی ڕای جەماوەر بێت، یاسا دانارێت تەنیا بە گوێرەی ئەو شتەی بە مێشکیان دادێت. هیچ دەستکاریەکیش لە یاسادا ناکرێت تەنیا مەگەر خۆیان پێی رازی بن، هەرشتێکیش بیرو مێشکیان پەسندی نەکرد ئەوا فرێ دەدرێت و لە دەستور دەهێنرێتە دەرەوە.

ئەمە خاسیەتەکانی دیموکراتییە، بێ گومان ئاشکراو ڕوونە ئەمەش هەر فڕی بەسەر ئیسلامەوە نییە. بۆیە راست نییە ووشەی دیموکراتی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی بەکار بێنین. بەڵکو بە دەربڕینێکی راستتر دەتوانین بە (ثیۆکراسی) (Theocracy) یاخود (حکومەتی خوایی) ناوی بنێین. بەڵام دەبێ بزانین ثیۆکراسی ئەورووپی چاخەکانی ناوەڕاست، بە تەواوی جیاوازە لەگەڵ ثیۆکراسی ئیسلامی، چونکە ئەورووپا تەنیا ئەوەندە ثیۆکراسی ناسیوە کە تاقمەیەك لە قەشەکان (Priest Class) و مجێورو پەردەدار بێن و

لە خۆیانەوە یاسا بۆ خەڵك دابنێن[1] و خوایەتی خۆیان بەسەر خەڵکی ئەو وولاتانەدا داسەپێنن و لە پشتی پەردەی یاسای خواییش خۆیان بشارنەوە[2].

ئەم جۆرە فەرمانڕەواییە وا چاکتر بە فەرمانڕەوایی شەیتانی ناوببرێن نەك فەرمانڕەوایی خوایی.

کەچی ئەو ثیۆکراسییەی کە ئیسلام هێنای نابێ کاروباری بکەوێتە دەست چینێك لە مجێورو شێخ و پیر، بەڵکو دەبێت بکەوێتە دەست گشت موسڵمانان، ئەوانەی کە هەر بەخۆیان کاروبارەکەی بە گوێرەی قورئان و پەیرەوی پێغەمبەر بەڕێوە دەبەن. بە واتایەکی تر بریتییە لە حکومەتێکی (ثیۆ - دیموکراسی) (Theo- democracy) واتە: (حکومەتی دیموکراتی- خوایی) بۆ ئەم شێوەیەی حوکم، چونکە خوای گەورە ڕێگەی بە موسڵمانان داوە کە دادوەرییەکی میللی دیاری کراویان (Limited popular sovereignty) هەبێت بە مەرجێك بە دەسەڵاتی بەرزی خوایی (paramouncy) زەبردارو فەرمانە بێ وێنەکەی بەسترا بێتەوە. دەسەڵاتداری بەجێهێنان(Executive Power) دەبێت بە بیروڕای

---

(١) پاپا و قەشەکان لە بارەی یاسا و شەریعەت بێجگە لە چەند ئامۆژگارییەکانی خوو ڕەوشتی کە لە حەزرەتی عیساوە بۆیان مابوو، هیچی تریان نەبوو، بۆیە بە گوێرەی هەواو ئارەزووی خۆیان یاسایان دادەناو بەسەر خەڵکیاندا دەسەپاند و دەیان گوت ئەمە لە خواوەیە، هەروەکو لە قورئاندا هاتووە ﴿فويل للذين يكتبون الكتاب بأيديهم ثم يقولون هذا من عند الله...﴾. (البقرة- ٧٩).

(٢) مجێور و پەردەدار و دەرگەوان لە کۆنەوە بەوانەوە گوتراوە کە لەسەر قەبرو بت خانەو شوێنە ئاینییەکان دەژیان و خزمەتی ئەو شوێنانەیان دەکرد و بەناوی بت و ئاینەوە قسەیان دەکرد و خەڵکی یان هەڵدەخەڵەتاند.

موسڵمانان پێك بێت. هێنانه خوارەوەشی له شوێنی خۆی دەبێت بەدەستی ئەوان بێت. هەروەها هەموو کاروبارێك مەگەر تەنها ئەوەی کـه حوکـم یـا دەق (نص) ێکی راستەو راستی لـه شـەریعەتدا لەسـەر هـەبێت، ئـەگینا ئەوی تر هەرچییەك بێت دەبێ بـەڕای گشـتی موسـڵمانان کۆتـایی بێـت و بڕێتەوە. هەروەها بۆ هەر کاتێك یاسایەك روون کردنەوەی پێویسـت بوایـه یا دەقێك له دەقەکانی شەرع شیکردنەوەی بویستایه لێرەدا تـەنیا چینێـك یا خانەوادەیەك تايبەت نەبوون بـۆ ڕوون کردنەوەکـەی بـەڵکو هەرکەسـێك لەناو موسڵمانان توانای پلەی (اجتهاد)ی هەبوایه ئەوا بەم کاره هەڵدەستا.

لەم ڕووەوە فەرمانڕەوایی ئیسلامی بە دیموکراتـی دەژمـێردرێت، بـەلاّم هەروەکو له پێشوو باسمان کرد ئەگەر هاتوو دەقێك هەبوو ئـەو کاتـه هیـچ فەرماندەیەکی موسـڵمانان یـا (مجتـهد) ێـك یـا زانایـەك لـه زانایـان یـا ئەنجومەنی یاسادانان (legislature) بگره هەموو موسڵمانانی جیهان بۆیان نییه ووشەیەك چییه بگـۆڕن یـان دەسـتکاری بکـەن، لـەم ڕووەوە دەبینـین فەرمانڕەواییەکی ثیۆکراسییه.

## بەرپەرچ دانەوەی تێکەڵی یەك (دفع شبهة)

لەوانه یەکێك بڵێ ئیسلام دیموکراسییەتی بەند کردووه بە جۆرەها کـۆت و سنور ئەمەش مانای وایه ئیسلام سەربەخۆیی هـەڵبژاردنی راو بـیری لـه خەڵك زەوت کردووە، کەچی لە هەمان کاتدا ئێوه دەڵێـن خوایـەتی خـوای گەوره سەربەخۆیی قسەو و بیرو هێزی ئادەمیزادی بە خەڵك داوە، ئێمـەش دەڵێین: خوای گەوره خاسیەتی یاسادانانی بە خۆیەوە بەند نـەکردووە تـاکو سەربەخۆیی فیتری له خەڵك بستێنیتەوە. بەڵکو بۆیه به خۆی بەند کـردووه

بۆ ئەوەی لە چەنگ دەست درێژی پیاوی خراپ بیپارێزێ، هەروەها تاکو خەڵك گومڕا نەبن و ڕێگای خوار نەگرن و تووشی فەوتان و نەمان نەبن، ئەو دیموکراسییە ڕۆژئاواییە هەڵخەڵەتێنەرەی کە ئەوان بەزاریان گرتووە و پیایدا هەڵدەدەن بەوەی کە حاکمیەت یا سەروەری میللی (popular sovereignty) تێدایە، ئەگەر بێتوو بە ووردی سەرنجی بدەینێ دەبینین ئەوانەی کە ئەم حاکمیەت و دادوەرییەیان لیٚ پێك هاتووە هەموویان بەشداری دانانی یاساکان ناکەن و هەمووشیان جێبەجێی ناکەن، بەڵکو ناچار دەبن بیدەنە دەستی چەند کەسێك کە لە ناو خۆیان هەڵیان دەبژێرن بۆ ئەوەی یاسا دابنێن و ئەوانیش جێبەجێی بکەن، بۆ ئەم مەبەستەش ڕژێمی هەڵبژاردن دادەنێن بەو هەموو کەم و کورییەی کە هەیەتی، کەس تێیدا سەرناکەوێ تەنیا ئەوەی کە بتوانێ خەڵك هەڵبخەڵەتێنێ و بیرو مێشکی خەڵك بۆ خۆی رابکێشێ بە ماڵ و دارایی یا بە زانیاری و فێلبازی و پڕوپاگەندە درۆیینەکانی، پاشان ئەم یاسا ستەمی یە بەسەر خەڵکی ڕەش و ڕووتدا دەسەپێنن، بەهۆی ئەو هێزو توانایەی کە خەڵکە ڕەش و ڕووتەکە پێیان دابوون، لە دواییدا ئەو کەسانەی لە هەڵبژاردن سەردەکەون بە هۆی دەنگ دانی خەڵکی ڕەش و ڕووت، دەبنە خوای ئەم خەڵکە و بە کەیفی خۆیان یاسای وایان بۆ دادەنێن نەك بەرژەوەندی جەماوەری تێدا بێت بەڵکو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان و ئەو چین و تاقمانەی تێدا بێت کە دەگەڕێنەوە بۆیان، ئا ئەمەیە ئەو دەردە بێ دەرمانەی کە تووشی ئەمریکاو بەریتانیاو هەموو ئەو وولاتانەی تر بووە، کە گوایە ئەمانە بەناو بەهەشتی دیموکراسیەتی ئیمرۆن.

با چاو لەو هەموو خراپانە بپۆشین، وا دابنێین ئەو یاسایانەی لەم شوێنانە دادەنرێت ڕەزامەندی هەموو خەڵکی تێدایە، بێ گومان شتێکی

ئاشکرایە، هەروەك تاقی کردنەوەش سەلماندوویەتی کە خەڵکی ڕەمەکی بە گشتی ناتوانن بەرژەوەندی خۆیان بە تەواوەتی بزانن ، چونکە خوا ئادەمیزادی دروست کردووەو بێ هێزییەکی سروشتی (فکری) تێدا رسکاندوە. بۆیەی لە زۆربەی کاروباری ژیاندا بەشێك و لایەك لە لایەکانی ڕاستی تێبینی دەکەن، بەشەکەی تر نابینن، بە شێوەیەکی گشتی لێکدانەوەو حوکم (Judgement) یشیان ناوەستێتە سەر بنەڕەتێکی دادو عادلانە، زۆرجار لە کاروبارییاندا دەکەونە ژێر کاریگەری سۆزو بۆچوون و عاتیفەوەو بۆیە زۆر شت وەرناگرن و رەفزدەکەونەوە تەنیا لە بەرزاڵ بوونی سۆزو ئارەزوو و هەوەس بەسەریاندا، زۆر نموونەی وام لەبەردەست دایە، بۆ ئەوەی قسە قسە ڕانەکێشێ، لێرەدا تەنیا یەك نموونە دێنمەوە، ئەویش (یاسای قەدەغە کردنی مەی بوو لە ئەمەریکا) (Prohibition Law) خەڵکی ئەمریکا زۆر بە جوانی و بە شێوەیەکی ڕوون لە ڕوانگەی عەقلی و زانستییەوە بۆیان دەرکەوتبوو کە مەی (عەرەق) زۆر زیانی بۆ تەندروستی هەیەو هەر چەند هێزو ووزەی بیری و ژیری هەیە لە مرۆڤدا تێکدەدات، ڕووخێنەرە بۆ شارستانی مرۆڤ ...

بۆیە لەبەر ئەم ڕاستیانە و دڵنیا بوون لە پەسەندی و درووستییان ... رای گشتی ئەمریکا تێکڕا بڕیاریان لەسەر قەدەغە کردنی مەی دا.

بەڵام هێشتا یاساکە نەکەوتبووە قۆناغی جێبەجێکردن، بینیمان ئەوانەی بە ڕاو دەنگ دانی خۆیان دوێنێ بڕیاریان لەسەر ئەم یاسایە دابوو، بە خۆیان لێی پەشیمان بوونەوەو دەستیان کرد بە فەسادو خراپەکاری، ئەویش بە گەڕانەوەی بۆسەر مەی خواردن و داهێنانی جۆرەها ڕێگای نوێ لە دروست کردنی بە نهێنی، فەنتازی کردن لە دروست کردنی پیسترین جۆری مەی، زیاتر لە ڕادەی جاران، بۆیە گوناحکردن و خراپە لە ناویان

دەستی پێ کردو زیاد بـــوو تـا ئەندازەیـەکی وا کـە ناچـاربن ئـەو شـتەی حەرامیان کرد بوو حەڵاڵی بکەنەوە.

پاك و تەمیزی بۆ تۆ ئەی خوای گەورە، عەرەق کە (أم الخبائث)ە بۆ چی حەلاڵ کرا، ئایا ئەم عەرەقەی کە زیان بەخشە بۆتە سود بەخش بە بەڵگەی زانیاری و ژیری؟ نەخێر، بەڵکو لەبەر ئەوەی نەفسی خراپە ویست (الأمّـارة بالسّوء) یـان بەسـەریاندا زاڵ بـوو و ئـەوانیش جڵـەوی خۆیانیـان دابـووە دەستی، وەك بڵێی هەریەکێکیان نەفسی خۆی کردبێتە خوای خـۆی، بۆیـە سوور بوون لەسـەر بەندایـەتی ئـەو خوایـە ناڕەوایـە،تـا وای لێـهات ئـەو یاسایەی بەخۆیان دایان نابوو ڕەشی بکەنەوەو بیسڕنەوە، پـاش ئـەوەی لـە لایەنی زانستی و ژیرییەوە دانیان بە ڕاستییەکەی هێنا.

لە مێژوودا زۆر تاقی کردنەوەی تر هەیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە مرۆڤـ ناتوانێت لە خۆیەوە یاسـا بـۆ خـۆی دابنێـت، چونکـە ئەگـەر هـاتوو لـە مەترسی و زیانی بەندایەتی ئەم خوا درۆزنانە رزگاری بێت ئـەوا نـاتوانێت لە بەندایەتی هەواو هەوەسە نەفامییەکانی و خۆبەدەستەوەدان بۆ ئـارەزووە شەیتانییەکانی ناو دەروونی دەرباز بێت چونکی ئادەمیزاد زۆر پێویسـتیان بەوە هەیە کە سەربەخۆیی خۆیان ببەستنەوە بە سنورێ کە لەگەڵ خۆڕسـك و سروشتی مرۆڤایەتی بگونجێ ئەمەش قازانجی خۆیی و ئەو کۆمەڵگایـەی کە تێیدا دەژی تێدایە، لەبەر ئەم مەبەستە بەرزە خوای گەورە سـەربەخۆیی مرۆڤی بەستووەتەوە بە چەند بەندو سنورێك کە بـە زوبـانی ئیسـلام پـێی دەوترێت سنورەکانی خوا (حدود الله)، ئەم سنورانەش بریتین لە ژمارەیـەك لە ئوسولّ و بنچینەو ئەحکامی بڕاوە، تاکو ژیانی ئادەمیزاد لەسەر ڕاستی و دادپەروەری دابمەزرێت و لێك نەترازێت، ئەم سنورانەش وەك شورەی ڕێگا گرن، کەس بۆی نییە لێی تێپەر بێت... بەلاّم بۆیان هەیە چەند یاسـایەکی

ناسەرەکی و فەرعی یا چەند ڕژێم و ڕێکخستن (regulation) و بەرنامەیەك لە چوار چێوەی ئەم سنورانە دابنێین، بۆ ئەم کێشەو ڕووداوانەی[8] دێتە پێشیان، بەڵام ئەگەر لەمە زیاتر تێپەڕین، بێ گومان ئەو کاتە دەبێتە هۆی ئەوەی هاوسەنگی شیرازەی کۆمەڵگای ئادەمیزادی تێك بچێت.

## کەواتە مەبەست لە سنورەکانی خوا چییە؟

بۆ ڕوون کردنەوەی چەمکی[1] سنورەکانی خوا، دەڵێین خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی ژیانی ئابووری کردووە و چەند سنورێکی بۆ داناوە، کە ئەویش بریتییە لە سەلماندنی مافی موڵکداری تایبەتی (تاکی) و پێویستی زەکات دان و حەرام کردنی سوود و قومارو دەست بەسەر داگرتن (احتکار) و دانانی یاسای میراتگری و ... ) هەروەها بەستنەوەی کۆکردنەوەو بەخشینی ماڵ بە چەند سنورێکی ئاشکراو دیار، کە ئەگەر هاتوو مرۆڤ ئاگاداری ئەم سنورانەی کردوو پارێزگاری لێ کردو ژیانی ئابوری خۆی لە چوار چێوەی ئەم بازنەیە بەڕێوە برد، بێ گومان ئەوا سەربەخۆیی کەسایەتی (Personl Liberty) خۆی دەپارێزرێ و لە دەست ناچێ و لێی زەوت ناکرێ، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تر بەهۆی دەست بەسەر داگرتنی چینێك بەسەر چینێکی تر ئەو بارە نالەبارو خراپە دروست نابێت کە سەرەتاکەی بە سەرمایەداری خوێنمژ دەست پێ دەکات و لە پاشان بە دیکتاتۆریەتی کرێکاران کۆتایی دێت.

---

[1] - چەمك:مفهوم

هەروەها بۆ نموونە ژیانی ناو ماڵیش (Family life) ئەگەر هاتوو جڵەو بۆ ئافرەت بەرەڵڵا کراو دەرگای بۆ خرایە سەرپشت، بێ گومان ماڵەکە پـــر دەبێت لە ستەم و چەوسانەوە و ماف خواردن، دەبێتە هێلانەی شەیتان کـــە ئەویش هێلکەی تێدا دەکات و بێچووەی لێ دادەنێتەوە، بەڵام خوای گەورە ژیانی ناو ماڵی بە پەردەی (حجاب) ی شەرعی و جڵەو دانـــە دەســـت پیـــاو رێك خستووە و مـــافی پیـــاوو ئـــافرەت و منـــاڵان و یاســـاکانی تـــەڵاق[1] و خولع[2] و حوکمی هێنانی زیاتر لەیەك ژن و دانانی سزای داوێـــن پیســـی و (قـــذف)[3] ی ڕوون کردۆتـــەوە. ئـــەم هـــەموو شـــتانەی بـــۆ ئـــادەمیزاد ڕوون کردۆتەوە. بۆ ئەوەی ژیانی ناو ماڵ بـــە ســـنووری ڕێـــك و پێـــك و دروست لەگەڵ سروشت و فیترەی ئادەمیزاد ببەستێتەوە. هەر کاتێك مرۆڤ دەستی پێوە بگرێت و بەکاری بێنێت و بناغەی ژیانی ناو ماڵی لـــە چـــوار چێـــوەی ئەم سنورو پەیڕەوانە دابڕێژێت، بێ گومان ماڵەکـــەی دەبێتـــە بەهەشـــتێکی ئەوتۆ هەمیشـــە خۆشـــی و کامـــەرانی تێـــدا دەبینێـــت و هـــەرگیز لێشـــاوی سەربەخۆیی شەیتانی ئافرەتان!! کە ئیمـــڕۆ هێمنـــی و ئاسایشـــی جیـــهان و شارستانێتی مرۆڤی خستۆتە مەترسییەوە تخون ناکەوێت.

هەروەها خوای گەورە ســـنورەکانی شارســـتانێتی و ژیـــانی کۆمەڵایـــەتی ئادەمیزادی وەکو تۆڵە سەندنەوە (القصاص) لـــە کـــاتی کوشـــتنداو دەســـت بڕین لە کاتی دزی و حەرام کردنـــی مـــەی و ســـنوری لـــەش داپۆشـــین و زۆر

---

(١ ) تەڵاق: داواکردنی پیاو بۆ جیابوونەوە لە ئافرەت.

(٢ ) خلع: داواکردنی ئافرەت بۆ جیابوونەوە لە پیاو.

(٣ ) تاوانبارکردنی ئافرەتی پاك بە داوێن پیسی، بێ گومان ئەمەش تاوانە و ســـزای هەیە.

بنچینەی جێگیر و چەسپاوی تری ڕوون کردۆتەوە، بۆ ئەوەی هەتا هەتایێ دەرگای خراپە و فەساد داخات.

ئەوەی جێی داخە من ناتوانم ئێستا لەبەر کەمی کاتەکە بە درێژی باسی سنورەکانی خوا بکەم و بەتێرو تەسەلی لیّ ی بدوێم. کە تێیدا دەزانین چۆن هەر سنورێك لە سنورەکانی خوا گرنگییەکی مەزن و بەنرخ و کاریگەریەکی زۆر گەورەی هەیە لە دامەزراندنی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر ڕاستی و سوود بەخشین، بەڵام پێویستە ئەوەش بزانین کە خوای گەورە بەهۆی ئەو سنورانەوە ڕژێمێکی سەربەخۆو دەستورێکی (constitution) کۆکەرەوەی بە مرۆڤ بەخشیوە، کە بە هیچ جۆرێك بە گۆڕین و گۆڕینەوە ڕازی نابێت، سەربەخۆیی لە مرۆڤ ناستێنێتەوەو هێز و ووزە بیری و ژیرییەکانی لەکار ناخات، بەڵکو دەیەوێت ڕێبازێکی ڕووناك و ڕێگایەکی ڕاست بۆ بەرەی ئادەمیزاد دابنێت، نەوەك ئادەمیزاد سەری لیّ بشێوێ و بکەوێتە لێژاوی ژیانێکی تاریك، بەهۆی ئەو نەفامی و لاوازی و کەم بینیە خۆرسکییەی کە لەسەری دروست بووە، نەوەك ئەو هێزو ووزەو کۆششەی هەیەتی لە ڕێگای ناهەق و ناڕەوا بفەوتێ، بەڵکو تاکو ڕێگای دەرباز بوونی ڕاستەقینە بە جوانی بگرێت و تووشی سەر لیّ شێوان و پێ هەڵخلیسکان نەبێت.

نمونەی ئەم سنورانەش وەك ڕێگای ناو چیاکانە، بۆ نمونە ئەگەر ڕێکەوت بچیتە سەر چیایەك لەو کاتەدا دەبینی چەند ڕێگایەکی پڕ مەترسی تێدایە، لە لایەك دەبینی لێژاییەکی زۆر قوڵە و لە لاکەی تریش چەند بەردی گەورە قیت بوونەتەوە، جا ئەگەر بینیت چەند تەلی ئاسن چەقێنراوە، نەوەك ئەو ڕێبوارەی پێیدا دەڕوات بکەوێتە خوارەوە، ئایا بۆت هەیە بڵێی ئەم تەلانە چەقێنراون وەك کۆسپە و بەربەستێك لە ڕێ ی

سەربەخۆیی ڕێبواران؟ نەخێر، بەڵکو دانراون تاکو لە فەوتان و مردن بپارێزرێن و نەکەونە مەترسییەوە، چەقێنراوە بۆ ئەوەی لە شوێنی خلیسکاوی و پر مەترسی ڕێگەیان نیشان بدات و بۆ ئاڕاستە ڕاستەکەیان ببات. تا دەگەنە ئەو شوێنەی کە دەیانویست.

ئەمە وێنەیەکە بۆ سنورەکانی خوا لە ئیسلام، کە ئاراستەی ڕاستەقینەی ڕێڕەوی ژیانی ئادەمیزادی دەست نیشان دەکات و خەڵکی لە هەموو دووڕیانی یەك (مفترق الطرق) و هەوراز و نشێوێك بۆ ڕێگای ئاسایش و ئاشتی ڕێنمایی دەکات، لە هەموو ئاراستەیەکی چەوت و نارەوا لایان دەدات و بەرەو ئاراستەیەکی ڕاستیان دەبات.

ئەم دەستورو ڕژێمە خوایی یە کە باسمان کرد، بە هیچ جۆرە گۆڕین و گۆرینەوەیەك ڕازی نییە. ئەگەر ویستت ئەوا لیّ ی دەردێی و لە گەڵیدا دەجەنگی، هەروەکو تورکیا و ئێران[1] لیّ ی دەرهاتن، بەڵام بۆت نییە کەمترین دەست کاری تێدا بکەیت چونکە دەستورێکی خوایی هەتا هەتایی یە هیچ گۆڕین و گۆڕینەوەی تێدا نییە، بۆی نووسراوە دەبێ چەسپاو ئاشکرا بێت تا ڕۆژی قیامەت. دەوڵەتی ئیسلامی کاتێ بناغەی دادەمەزرێت، مادام کتێبی خواو پەیڕەوی پێغەمبەر لە دنیادا مابن ناتوانرێت ماددەیەك چییە لەم یاسایە لە شوێنی خۆی لادرێت. هەر کەسێکیش بیەوێت بە موسڵمانی بژی ئەوا ناچارە دەبێت شوێنی بکەوێت و دەستی پێوە بگرێت.

---

(١ )لە زەمانی ڕەزا شای بەهلەوی و کەمال ئەتاتورك کە دوو دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوون.

## ئامانجی دەوڵەتی ئیسلامی

بۆ ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەی کە لەسەر بنەڕەتی ئەم دەستورە وەستاوە، ئامانجێك هەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا لە چەند شوێنێك باسی کردووە، یەك لەوانە:-

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الكِتَابَ وَالمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ... ﴾ (الحديد- ٢٥) واتە: (بەراستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمان ناردووە بە بەڵگەی ئاشکراو ڕوونەوە لەگەڵ ئەوان کتێب و تەرازوومان ناردووە تا خەڵك بە دادگەری لە ناویەکدا ڕەفتار بکەن، ئاسنیشمان ناردۆتە خوارەوە کە لەوا سەختی و هێزی توند هەیە و سوودیشی بۆ خەڵك هەیە...).

ئەم ئایەتە ئەو ئامانجەی کە پێغەمبەرانی خوا لە پێناو دا دەنێردرێت ڕوون کردۆتەوە و مەبەستی خوای گەورەش لە ناردنی ئەم پێغەمبەرانە دامەزراندنی ڕژێمێکی دادپەروەری کۆمەڵایەتی بووە لە جیهان، لەسەر بناغەی ئەو بەڵگە و ئایەتانەی کە بۆ ئادەمیزادی ناردووە، ئەو چاکەیەی کە لە گەڵی کردوون هەروەك لە قورئاندا باسی کردووە، ئەویش کە تەرازووی داونەتێ، مەبەستیش لە تەرازوو ئەو ڕژێمە دادپەروەرییە یە بۆ دادگەری کۆمەلایەتی (Social justice). هەر وەکو لە شوێنێکی تر دەفەرموێ:

﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاةَ وَآتَوا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوا عَنِ الْمُنْكَرِ...﴾ (الحجّ- ٤١) واتە: (ئەوانەی ئەگەر لەسەر ڕووی ئەم زەمینە دایانمەزرێنین، نوێژ بەجێ دەگەیەنن و زەکات دەدەن و فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە دەکەن).

﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ...) (آل عمران- ١١٠). واته: (ئێوه ئەی موسڵمانان باشترین کۆمەڵن لەناو خەڵکدا بەدەرکەوتن، فەرمان بە چاکە دەکەن و لە کاری بەد فەرانە ڕێگە دەگرن باوەڕیشتان بەخوا هەیە...):

جا هەر کەسێك لەم ئایەتانە ورد بێتەوە، ئەوەی بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەو دەوڵەتەی قورئان دەیەوێت ئامانجێکی سستی (سلبی) (Negative) نییەو بەس، بەڵکو ئامانجێکی چوستی (ایجابی) شی هەیە، واتە مەبەستەکەی تەنها ئەوە نییە شەڕو دەست درێژ کردنی خەڵك بۆ سەر یەکتری قەدەغە بکات و سەربەخۆیی بە خەڵك بدات و پارێزگاری لە دەوڵەت بکات، بەڵکو لە ڕاستییدا ئامانجە بەرزەکەی ئەو هێنانە دی ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی چاکە خوازە کە قورئان هێناویەتی، مەبەستیش لەمە دوورکردنەوە و نەهی کردنە لە هەموو ئەو گوناهانەی کە خوا لە قورئاندا بە خراپ ناوی بردووە، لە ڕەگ دەرهێنانی برکی خراپەیە و برەودانە بە چاکە و ئەو شتانەی کە ڕەزامەندی خوای تێدایە، هەروەکو لە قورئاندا روون کراونەتەوە، بۆ بەدی هێنانی ئەم مەبەستەش تاوێ هێز بەکار دەهێنرێت، تاوێ تریش بانگەوازی و راگەیاندنی گشتی وەردەگیرێت، هەروەها تاوێ تر هۆ و ئامرازەکانی پەروەردە و فێرکردنی بەکاردێت، جاری تریش ڕای گشتی و دەست رۆیشتن و دەسەلاتی کۆمەلایەتی بەکاردێت، بەو پێ یەی بارودۆخ پێویستی دەکات.

لە روالەتدا وا دیارە کە دەوڵەتێکی وا ناتوانێ بازنەی ئیشی خۆی لە بەشێکی بچوکی ژیان بخاتە کارو بەس، چونکە خۆی دەوڵەتێکی بەربلاو و گشتییە و هەموو لایەنەکانی ژیانی ئادەمیزادی بە تەواوی دەگرێتەوە ،

هەموو لقەکانی ژیانی ئادەمیزادی بە مۆری تیۆرە ڕەوشت بەرزو بەرنامە چاکە خوازییە تایبەتییەکەی خۆی مۆر دەکات.

کەسیش مافی ئەوەی نییە لە روویدا بوەستێ و بەشێك لە کاروبارەکەی جیابکاتەوەو بڵێ ئەمە کارێکی تایبەت بەخۆم و شەخسییە، نابێ دەوڵەت تخونی بکەوێت. بە شێوەیەکی گشتی دەوڵەتی ئیسلامی هەموو بەشەکانی ژیانی ئادەمیزادی و لقەکانی شارستانێتی گرتۆتەوەو بە پێی تیۆرە ڕەوەشت بەرزو بەرنامە چاکە خوازەکەی خۆی چاودێری دەکات. ئەمەش وا پێ دەچێت لای هەندێ کە ئەم دەوڵەتە لە دەوڵەتی فاشیستی و کۆمۆنیستی بچێت بەڵام لە دەوڵەتی ئیسلامی هەرگیز مۆرکی ئەو دەوڵەتە تۆتالیتار (Totalitarian) یانەو دەسەڵات پەرست (Authoritarian)انەی تێدا نییە. بەڵام ئەوەش تێبینی دەکرێ کە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بە هیچ جۆرێ سەندنەوەی مافی تایبەتی خەڵك و نیشانەی خۆسەپاندنی ملهوڕانە و سەرکردایەتی بێ پایانی تێدا بەدی ناکرێ. ئەو هاوسەنگییە تەواوەی لە ڕژێمی دەوڵەتی ئیسلامیدا هەیە و ئەو هێلە بەرینانەی کە کێشاویەتی لە نێوان راستی و نارەوایی بەسن ببنە بەڵگە بۆ مرۆڤی ژیرو هۆشمەند کە ڕژێمی وا ڕاست و چاك و مام ناوەندی مەگەر خوای گەورەو زاناو خەبیر نەبێت کەس ناتوانێت دای بنێت.

## دەوڵەتێکی فیکرییە

مەسەلەی دووەم ئەوەیە ئەو کەسەی بە ووردی سەرنج بداتە دەستووری دەوڵەتی ئیسلامی و ئامانجە پڕ پەندو هۆشمەندو دانانە چاکە خوازەکەی بۆی دەردەکەوێت کە تەنیا ئەوانە بە کاروباری ئەم دەوڵەتە هەڵدەستن کە

باوەڕیان بەم دەستووره هێناوەو کردوویانەتـه ئامـانجی ژیانیـان و جێگـەی چاوتیّ بڕینیان. بۆ بەرنامە چاکە خوازەکەی مل کەچ نەبوونـەو لایـەنگیری خۆیان بۆ پلانە کردەوەییەکەی پیشان نەداوە و بەس، بەڵکو باوەڕهێنان بـە ڕاستی فەرمانیشتەکانی چوپتە ناو دەمارو خوێنیان و خۆشیان ئاگـاداری و زانیارییەکی تەواویان بەگیان و سروشتەکەی و ئەو لق و پۆپانەی کـە لیّ ی جیادەبنەوە هەبووە. ئیسلامیش لـەم بارەیـەوە گـویّ ی نەداوەتـە سـنوری جوگرافی یا زمانی یا ڕەگەزی بەڵکو بە ئاشکرا دەستورەکەی خۆی پیشانی خەڵك دەدات و ئامانج و بەرنامە چاکە خوازەکـەی خـۆی ڕوون دەکاتـەوە. جا هەر کەسێك لەوان بەوە ڕازی بوو با هەرکیّ بیّ و یا بـۆ هـەر نـەوە یـا زەوی یا نەتەوەیەك بگەڕێتەوە دەتوانێت ببێتە ئەندامی ئەو دەستەیەی کـە دامەزرێنراوە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئەم دەوڵەتــە، هەرکەسـێکیش ڕازی نەبوو ئەوا هەرگیز بۆی نییە دەسـتی خـۆی لـە کاروبـاری دەوڵـەت وەردا، دەتوانێت لە سنوری ئەم دەوڵەتە وەك خەڵکی لە ئەستۆ (Subject) بـژی و ڕابوێرێت و تام لەو مافە دادپەروەرییانــە بکـات، کـە لـە شـەریعەتدا بـۆ ئەوانەی وەك ئەم وان ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها لە لایەن ئیسلامەوە پارێزگاری لــە نـەفس و مـاڵ و ناموسـی دەکرێت، بەڵام بە هیچ شـێوەیەك نابـیّ بەشـی لـە حوکمگـێڕاندا هـەبیّ، چونکە دەوڵەتەکە دەوڵەتی کۆمەڵێکە بیرو باوەڕێکی تایبەتی و فکرەیەکی تایبەتی یان هەڵگرتووە، شتێکی ڕوونە کە دەوڵەتی ئیسـلامی دووره لـەو کارە ناشیرین و نائادەمییە سەر شۆڕکەرانەی کە دەوڵەتــە کۆمۆنیسـتەکان دەیکەن بەرامبەر بەوانەی کە لەگەڵ تیۆرەکانیدا ناگونجێن.

هەروەها لە ئیسلامدا بە پێچەوانــەی دەوڵـەتی کۆمۆنیسـتی بـە هیـچ جۆرێك بیروڕا کۆمەڵایەتی و پەیرەوە ئاوەدانییـەکان بـە زۆری ناسـەپێنرێن

بەسەر خەڵكدا ، پاش زاڵ بوون بەسەریاندا و دەسەلاَت پەیدا كردن و بەكاربردنی ماڵ و سامانیان و ڕێژتنی خوێنیان و سەركوت كردنیان بە ئاگرو ئاسن، یاخود بە هێنانی سەدان هەزار خەڵكی بێ تاوان و فڕێ دانیان لە بیابانی سیبریا، كە دۆزەخی سەر رووی زەمینە. بە شێوەیەكی گشتی ئەو ماف و زێدەماف(امتیازات) انەی كە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بە خەڵكی لە ئەستۆ دراوە و ئەو هێلاَنەی ئیسلام لە نێوان راستی و نارەوایی و لە نێوان دادپەروەری وستەم لەم بارەیەوە كێشاویەتی ، هەر كەسێك بینیبێتی و جوانییەكەی بۆ دەركەوتبێ، ئەوا بەئاشكرا ئەو جیاوازییە مەزنەی بۆ دەردەكەوێت كە لە نێوان ئەو چاكە خوازە خواییانەو ئەو تەڵەكە بازانە هەیە لە ڕووی كارو بەرنامەی چاكە خوازیەكەیان.

## تیۆری جێ نشینی

ئێستاش دەبێ پێكهاتی دەوڵەتی ئیسلامی و شێوەی دروست بوونی چۆن بێت؟ هەروەكو باسمان كرد، لە ئیسلامدا، فەرمانڕەوای راستەقینە هەر خوا خۆیەتی، ئەگەر بێتوو سەرنج بدەیتە ئەم تیۆرە بنەڕەتییە بۆ ئەوەی بزانی شوێنی ئەو كەسانە چییە كە هەڵدەستن بەجێبەجێ كردنی یاسای خوایی لەسەر رووی زەمین، بۆت روون دەبێتەوە كە شوێنیان وەكو شوێنی ئەو كەسانەیە كە جێگری فەرمانڕەوایی ڕاستەقینەن، هەروەها ئەمە شوێنی هەموو كاربەدەستێكە لە ئیسلام، بەهەمان شێوە، هەروەكو خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ...﴾ (النور- ٥٥) واتە: (خوای گەورە بەڵێنی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوەو چاكە دەكەن لە

ئێوه، که لەم زەمینه بیان کاته جێ نشین هەروەکو ئەوانەی پێشووی کـرده جێنشین...).

ئەم ئایەته زۆر بـه جوانـی تیـۆری دەوڵـەت (Theory of state) لـه ئیسلامدا ڕوون دەکاتەوه، چونکه خوای گەوره دوو شتی مـەزن و بنـەڕەتی لێرەدا دیار دەکات.

یەکـەمیان: ئیسـلام هـەردەم ووشـەی جـێ نشـینی (Vicegerency) بەکارهێناوه له جیـاتی ووشـەی حاکمیـەت و سـیادەت یـا سـەروەری یـا دەسەڵاتی بێ سنوورو (Sovereignty)، ئەگەر بێتـوو حاکمیـەتیش تـەنیا تایبەت بێت بەخوا، ئـەو کاتـه هەرکەسـێك هەڵبسـتێ بـه فـەرمانڕەوایی لەسەر رووی زەوی له ژێر دەسـتوری ئیسـلامی، ئـەوا دەبێتـه جێنشـینی (Vicegerent) فەرمانڕەوای گەوره، جێنشین تەنـها دەسـت دەخاتـه ئـەو کاروبارانـەی کـه فـەرمانڕەوای گـەوره ڕێگـەی پـێ داوه وەك موڵـك و داراییەکەی وکاروباری بەندەکانی، له جیاتی فەرمانڕەوا.

دووەمیان: ئەوەی ئەم ئایەته سەرنج ڕاکێشه ئەوەیه کـه خـوای گـەوره بەڵێنی جێ نشـینی بـه هـەموو موسـڵمانەکان داوەو نـەی فـەرمووه مـن یەکێکیان دەکەمه جێنشین لەوەدا دیاره موسڵمانان هەموویان جێ نشـینی خوان. ئەم جێ نیشینییەش که به ئیمانداران دراوه جێ نشینیەکی گشتییه (popular vicegerency) ناکرێ تاکێ یا بنەماڵەیێ یا چینێ به تەنیا بـۆ خۆی سوودی لێ ببینێ، بەڵکو هـەموو موسـڵمانێك لـه لایـەن خـوا جـێ نشینه. هەموو کەسێکیش لێپرسراوه له بەرامبەر خوا لەبـەر ئـەوەی جـێ نشینه هەروەکو له فەرموودەی پێغەمبەر (صلّى الله عليه وسـلم) هـاتووه (كُلُّكُمْ رَاعٍ وَ كُلُّكُمْ مَسْؤُلٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ)، هیچ کامێکیان له شـوێن و پایـه و پله لەوی تریان نزمتر نیه له هەر ڕوویێکەوه.

## دیموکراسی ئیسلامی:

ئەوەی پێشوو باسمان کرد بنــەمای دیموکراســی ئیســلامی بــوو، ئەگــەر بێتوو ووردبینەوەو بە درێژی لە بنچینــەی ئــەم جێنشــینییە گشــتییە کــە ئیسلام هێناویەتی ئەم ئەنجامانەمان بۆ روون دەبێتەوە:

١. ئەو کۆمەڵگایەی کە هەموو ئەندامێك تێیدا جێ نشین بێت، بە هیــچ جۆرێك خراپەکاری و جیاوازی چینایەتی، هەروەها زیان و خراپەی ئەو پلەو پایانــەی کــە لــە ڕووی ژیــانی کۆمەڵایــەتی (Social life) و جیـــاوازی بنەماڵەییدا پەیدا دەبێت، لێ نزیك نابێتــەوە. تاکــەکانی ئــەم کۆمەڵگایــە وەك و یەك دەبن ، هیچ کامێکیان لەوی تریان زیاتر نییە، تەنــها لــە ڕووی بەهرەی کەسایەتی و هەڵکەوتنی خۆی نەبێت. ئەمەش ئەو ڕاستییەیە کــە پێغەمبەر (صلّى الله عليه وسلم) زۆر بە جوانی ڕوونــی کردۆتــەوەو باســی کردووە (ليس لأحد فضل على أحد إلا بدين أو تقوى، الناس كلهم بنــو آدم وآدم من تراب، لا فضل لعربي على أعجمي ولا لأعجمــي علــى عربــي ولا لأبيض على أسود ولا لأســود علــى أبيــض إلا بــالتقوى)[1].کــاتی وولاتــی عــەرەب هاتــە نــاو باوەشــی دەوڵــەتی ئیســلامی پــاش فــەتحی مەکـــە- پێغەمبەر- صلّى الله عليه وسلّم - بە هۆزو قەومەکەی خۆی فــەرموو کــە ئەوسا کە، هۆزی قورەیش لەناو وولاتی عەرەب خــاوەن پایــەکی بــێ وێنــە بوون وەکو براهمییەکان لە هیند (يا معشر قريش إن الله قد أذهــب عنكــم نخوة الجاهلية وتعظمها بالآباء، أيها الناس: كلكم من آدم وآدم مــن تــراب،

---

(١ )المسند لإبن حنبل رحمه الله تعالى، ملتقى الأخيار مع نيل الأوطــار (جزء: ٤ ، ص٣١١).

لا فخر للأنساب، لا فضل للعربي على العجمي ولا للعجمي على العربـي) ﴿...إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ...﴾(١). واتە ﴿ئەی قورەیشییەکان: خـوای گەورە دەماری نەفامێتی و خۆ بە گەورە زانینی بە هۆی بنەماڵەو بنەچەوە لەناو ئێـوە هـەڵگرتووە، ئـەی خەڵکینـە ئێـوە هـەمووتان لـە ئـادەمن و ئادەمیش لە خۆڵەوە پەیدا بووە، جا شانازی کردن بە بنەچەو نەسەب نابـێ هەبێ، هیچ عەرەبێك لــە عەجـەمێك زیـاتر نییـە، هیـچ عەجـەمێك لـە عەرەبێك زیاتر نییە ئەو کەسە لە لای خوا لە هەمووتان بـەرێزترە کـە لـە هەمووتان بە پارێزترە.

٢. لەم چەشنە کۆمەڵگایەدا کۆسپ و بەربەستی وەك بنەچە (النسـل) یـا پیشە و یا پلە و پایە لەناو کۆمــەڵگادا، لـە نێـوان تـاکێك یـان کۆمەڵـە تاکێك نابێتە گرێیەك لە رێگای پەرەپێدانی بــەهرەی کەسـایەتی و گەشـە پێدانی توانای تاکی و جۆراوجۆر لەناو دڵ و دەرونی ئەم تاکانە، بەڵکو هەر تاکێکی ئەم کۆمەڵگایە بۆی هەیە پەرە بدات بە خۆی تــا ئـەوەندەی خـوا حەز دەکات و تا ئەو ڕادەیەی کە خوا لە هێزو توانا پێیــداوە، بـێ ئـەوەی ڕێگە لە پێشــکەوتن و پەرەسـەندنی کەسـی تـر بگـرێ، ئـەم شـتەش لـە ئیسلامدا بە جوانترین شێوە دەبینی کــە کـەس ناتوانـێ بیگاتـێ، مـوالی (غەیرە عەرەب) نەوەکانیان دەکرانە والی ناوچــەکان و سـەرکردەی سـوپا، لەگەڵ ئەوەشــدا دەبینــین کامــەی لـە بنەماڵـەی خانـەدان و نـاودار بـوون شوێنییان دەکەوتن و لە ژێر فەرمانڕەواییان دەژیان بە خۆشی خۆیــان نـەك بەزۆرە ملێ، هەروەها دەبینین ئەوانەی کە تا دوێنێ نەعلیان لــە پـێ بـوو بوونە پێشەواو ڕابەر. هەروەها بێجگە لەمانە، لەوانەی تریش کــە جـولا و

(١) الجامع للترمذي- مشكاة المصابيح: باب المفاخرة.

بازرگان بوون یا پیشەو کاری تریان دەکرد، دەهاتن و پلەی ئەمینداری و داد پرسیان (قضاء) دەگرتەوە، کە ئەمانە ئیمرۆ هەموویان لە پیاو چاکانی زەمانی بەرایی و زانایانی ئیسلام دەژمێردرێن (إسمعوا وأطيعوا ولو استعمل عليكم عبد حبشي)[1].واتە: (گوی بگرن و گوێ ڕایەلی بکەن ئەگەر هاتوو بەندەیەکی حەبەشیش بووە کاربەدەست لەسەرتان).

٣. لەم جۆرە کۆمەڵگایەدا هیچ کەسێك یا تاقمەیەك بۆی نییە بە تەنها جڵەوی کاروبار بگرێتە دەست خۆی، یا بچێتە تەخت و عەرشی زۆرداری و دیکتاتۆریەت، چونکە هەموو تاکێك لە تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە جێ نشینێکە، بۆیە نابێ چینێك یا دەستەیەك یا تاکێك لەم تاکانە مافی جێنشینی لە دەست جەماوەری موسڵمانان دەربهێنێ و خۆی بەسەریاندا بسەپێنێ، هەر کەسێکیش لە ئیسلامدا ئەم پایە وەرگرێت، دەبێت بزانێت کە جەماوەری موسڵمانان یاخود جێنشینەکان، جێنشینی خۆیان داوەتە دەست یەکێك لە خۆیان و تەنها لەویان کۆکردۆتەوە (Concentrated) تاکو فەرمانەکان جێبەجێ بکات و بە ئاسانی کاروباری میللەت بەڕێوە ببات، ئەویش دوای رازی بوونی جەماوەر و یەك بوونی قسەیان لەسەر ئەم مەسەلەیە، جا خۆی لە لایەك لێپرسراوە لە لایەن خوا لە لایەکی تریش لە لایەن جێ نشینەکان یاخود موسڵمانەکان، ئەو موسڵمانانەی کە کاروباری جێنشینییان پێداوە، ئەگەر هاتوو ئەمیش کاروباری تەنیا بۆ خۆی ڕەخساند و خۆی کردە دکتاتۆرێك کە هەموو کەس بێ سێ و دوو دەبێ گوێ رایەڵی بکا، بێ گومان ئەو کاتە دەبێتە داگیر کەرو زەوت کەر نەك جێنشین، چونکە لە راستیدا دیکتاتۆریەت دژی جێنشینی گشتییە، ئەوەی

---

[1] الجامع الصحيح للبخاري- مشكاة المصابيح، باب الأمارة.

جێی گومان نییه ئەوەیە کــە دەوڵــەتی ئیســلامی دەوڵــەتێکی دەســەڵات بڵاوەو هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە، بەڵام بنچینەی ئەم دەســەڵات و ئاگاداربوونــە لــە هــەموو لایەنــەکانی ژیــان (Totality) لـەوە دایــە کــە یاسایەکی خوایی فراوان و کۆکەرەوەیە کــە بــە فــەرمانڕەوایی موســڵمانان سـپێردراوە لـەناو خـەڵکدا جـێ بـەجێی بکـات، ئەوهــــەموو نیشـــانەو فەرمایشتانەی لە قورئانی پیرۆزدا هـــاتووە کـە هـەموو ڕووەکـانی ژیـانی مرۆڤی گرتۆتەوە، دەبێت بـە شـێوەیەکی گشـتی و ڕێـك و پێـك و فـراوان جێبەجێ بکرێــت. کـە هـەموو لایـەنێك بگرێتــەوە. بـەڵام فـەرمانڕەوای موسـڵمانانیش نـابێت لــە خۆیـــەوە ڕێگـــەی بـــەندکردنی کۆمەڵایـــەتی (Regimenation)[1] بگرێتە بەر و ئەو ئەم هەموو فـــەرمایش و بەڵگــە و نیشانانە گوێ بخا، بۆنموونە ناتوانێت بە زۆری خەڵك ناچار بکات پیشـــەیەك هەڵبژێرن بێجگە لە پیشەیەکی تر، هــەروەها نــاتوانێت زۆریــان لێ بکــات تاکو بە تەنیا هونەرێکی تایبەتی وەرگرن یاخود منداڵــەکانیان فـێری جـۆرە زانیارییەك بن بێجگە لـــە جۆرێکــی تــر. چونکـە ئیســلام ئـەو دەســەڵاتە بێپایانەی نەداوە بــە فــەرمانڕەوا، وەك ئـەوەی تاغوتــە دەســەڵاتدارەکانی ڕوسیا پەیدایان کرد بوو، هەروەها لە تورکیاشــدا (ئـەتاتورك) بـە دەسـتی کەوتبوو و بەکاری هێنا بوو، شتێکی تریش هەیە گرنگە ئەویش ئەوەیە کە هەموو تاکێك لە موسڵمانان لێپرسراوە لە لایەن خـــوا بــە ســیفەتی تــاکی خۆی و بەس (Personal Responsibilitiy) کە کەس تێیدا بەشدار نییــە،

---

(١) زاراوەیەکە لەو وڵاتانە باوە کە دەسەڵاتی دکتاتۆری تێدابـــووە وەکـو ئــەڵمانیاو ئیتاڵیا، ماناکەی ئەوەیە کە دانیشـتوانی وڵاتەکـە بـە گشـتی بـەتوندی بـە یاسـای حکومەت ببەسترێنەوە لە هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەلایەتی و ئابووری یــان (م. الندوی).

بۆیە پێویستە هەموو کەسێك سەربەخۆییەکی تەواوی پێ بدرێت لە سنوری یاسا، بۆ ئەوەی ئەو رێبازو پلانە هەڵبژێرێت کە خۆی ئارەزووی دەکات و ئەو ووزەو هێزەی هەیەتی دەربخات لەو پیشەو کارانەی کە خۆی حەزی لێ یەتی، ئەگەر هاتوو لە لایەن فەرماندەوە کۆسپ و تەگەرەی هاتە سەر رێ، بێ گومان ئەوە بە زوڵم و ستەم دادەنرێت و لە لایەن خواش سزا دەدرێت. هەر لەبەر ئەمەشە نیشانەی ئەم جۆرە بەند کردنە کۆمەڵایەتییە لە سەردەمی پێغەمبەر (صلّی الله علیه وسلم) و خەلیفە راشیدەکان نابینی.

٤. لەم کۆمەلگایەدا هەموو تاکێك نێر بێت یا مێ بە مەرجێ بالغ بێت مافی ئەوەی هەیە کە دەربارەی چارەنووسی دەوڵەت ڕای خۆی دەربڕێت، چونکە ئەویش بەشی خۆی پێ دراوە لە جێنشینی گشتی، خوای گەورە ئەم جێنشینەیەی بە مەرجی تایبەتی وەك لێ هاتوویی و سامان و دارایی نەبەستۆتەوە، بەڵکو بە مەرجی بیرو باوەڕو کردەوەی چاکی بەستۆتەوەو بەس، موسڵمانەکانیش یەکسانن لە دەنگ دان و دەربڕینی ڕای خۆیان.

## تەبایی و گونجانی نێوان تاك و کۆمەڵ

ئەمە تۆزێکە لە ڕووە جوانەکانی رژێمی دیموکراتی چاکە ویست کە لە ئیسلامدا هەیە، لە لایەکی تر ئیسلام دەرگای تاك رەوی (Individualism) ڕوخێنەر بۆ کۆمەڵایەتی (Socialism) داخستووە، لە ئیسلامدا کەسایەتی تاك نافەوتێ وەك لە رژێمی کۆمۆنسیتی و فاشی دەفەوتێ، هەروەها تاك لە سنوری خۆی تێ ناپەرێ بە جۆرێك زیان بە کۆمەڵ بگەیەنێت وەکو لە رژێمی دیموکراسی رۆژئاوادا هەیە، چونکە لە ئیسلامدا ئامانجی تاك هەمان ئامانجی کۆمەڵە. کە ئەویش جێبەجێ

کردنی یاسای خواییە لە دنیاو ڕەزامەندی ئەوە لە ڕۆژی دوایی. لەمە زیاتر ئیسلام ئەو مافانەی داوە بە تاك کە پەیوەندی بەخۆی هەیە، هەروەها چەند ئەرك و واجباتێکی لەسەر داناوە کە پەیوەندی بە کۆمەڵەوە هەیە، بەم پێ یە گونجاندنێکی (Harmony) سەیر لە نێوان تاك و کۆمەڵ لە ئیسلامدا پەیدا بووە، بە جۆرێك تاك لە توانایدا هەیە گەشە بە ووزە و هێزی خۆی بدات و پەرە بە کەسایەتی خۆی بسێنێ، پاشان ببێتە پاڵپشتێك بۆ ئەو ووزەو هێزە گەشە پێدراوەی خۆی لەوەی کە چاکە و بەختیاری کۆمەڵگای تێدایە. بەم بیرۆکە خێرایە ئومێدەوارم توانیبێتم دەرگای ئەو ئالۆزی و ناتەباییە دابخەم کە خوێنەر تێ ی دەکەوێت، لە کاتی خوێندنەوەی ئەو ڕاڤەیەی کە بۆ دیموکراتی ئیسلامی کرا، لەو بەندەی پێشوو.

## دەوڵەتی ئیسلامی لە چی پێك دێت؟

ئەگەر هاتوو سەرنج بدەیتە ئەم روون کردنەوەی کە تازەکردمان، لە بۆچوونی (Conception) جێنشینی گشتی و ئاگاداربوون لە هەموو لق و پۆپەکانی، بە درێژی بۆت دەردەکەوێت کە شوێن و پایەی پێشەوا یا فەرماندە یا سەرکردە لە دەوڵەتی ئیسلامی بە کورتی ئەوەیە کە جەماوەری موسڵمانان- جێنشینەکان- لەناو خۆیان یەکێکیان هەڵبژاردووە کە لە هەموویان چاکترو پاکترە، ئەمانەت و راسپاردەی جێنشینیان پێ داوە، بەڵام ناونرانی بەجێ نشین (خەلیفە) مانای وانییە تەنیا ئەو جێ نشینە، بەڵکو مانای وایە کە جێ نشینی موسڵمانان بە گشتی هەمووی لە خۆیدا کۆبووەتەوە، ئێمەش بە شێوەیەکی کورت و بە گشتی و بەسەر پێ

ی وێنەی فەرمانڕەوای ئیسلامیتان بۆ دیـار دەخـەین و ئاشـکرا دەکـەین، تاکو بە جوانی ئەم وێنەیەتان لە لابدرەوشێتەوە، سـەرکەوتنیش لـە لایـەن خواوەیە:

یەکەم: هەڵبژاردنی فەرماندە (امیر) لەسەر بناغەی ئەم ئایەتـە پـیرۆزە نەبێت، نابێت ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات- ١٣).

تەنیا ئەو کەسە هەڵدەبژێرێت بۆ فەرمانڕەوایی و ئیمارەت کـە جێگـای بڕوایی بێت لە لایەن موسڵمانەکان لە بارەی رەوشت و سروشت و رەفتـاری، جا ئەگەر هەڵبژێردرا ئەوا دەبێتـە خـاوەنی فـەرمان لەسـەر موسـڵمانان و دەبێت گوێ ڕایەڵی بکرێت و هیچ فەرمانێکی دوانەخرێت، بەڵکو دەبێ لـە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی بەتـەواوەتی پشـتی پـێ ببەسـترێت، مـادام دوای شەریعەت کەوتووەو بە پێی قورئـان و پـەیڕەوی پێغەمبـەر فـەرمان دەدات.

دووەم: فەرماندەی ئیسلامی هیچ لە جەماوەری موسڵمانان زیاتر نییـە، بە گوێرەی یاسا، بەڵکو ئەویش یەکێکە لەوان، رەخنەی لیٚ دەگـیرێت لـەو شتانەی کە لەبەر چاوی خەڵکدا بـە هەڵـە دانـراوە، کاتـێ خـەڵك بـەڕێوە دەبات، هەروەها لە پێ هەڵخلیسکانی ژیانی خۆیدا رەخنەی لیٚ دەگـیرێت. ئەگەر خەڵك داوایان کرد ئەوا لیٚ دەخرێت، کێشـەو قـەزایان لەسـەر بـەرز دەکرێتەوە لە دادگا، شایستەی ئەوە نییە لە دادگادا بەشێوەیەکی جیـا لـە موسڵمانان مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

سێیەم: فـەرماندە ناچـارە دەبـێ لـە کاروبـاردا رای خـەڵك وەرگـرێ، مەجلیسی شوڕاش پێویستە جێی بڕوای هەمووان بێت، شـتێکی پێویسـتە لە لایەن شەرع ئـەم مەجلیسـە بـە هـەڵبژاردن و دەنگدانـی موسـڵمانان و

دەربڕینی بیرو ڕایان بێتە کایەوە. هەر چەندە ئەمە لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان نەبووە.

چوارەم: کاروباریش بەهۆی زۆری ڕاو دەنگەکان دەچێتە سەر، لە زۆربەی کاتدا جێبەجێ دەکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام زۆری دەنگ و ڕا ناکاتە تەرازوویەك بۆ ڕاستی و ناڕەوایی.

﴿قُلْ لايَسْتَوِي الخَبِيْثُ وَ الطَّيِّبُ وَ لَوْ أعْجَبَكَ كَثْرَةُ الخَبِيْثِ﴾.

(پێیان بڵێ خراپە و چاکە ، پیسی و پاکی وەکو یەك نین، هەرچەندە زۆربوونی پیسی سەرت بێنێتە سوڕمان"مەندە هۆش" ت بکات). چونکە لەوانەیە لە ڕوانگەی ئیسلام تاکە پیاوێك ڕاکەی پەسندترو بیر تیژتر بێت لە مەسەلەیەك لە مەسەلەکان لەسەر ڕای هەموو ئەندامانی مەجلیس، جا ئەگەر ئەمە وابێ هەق نییە ڕای ئەو پشت گوێ بخرێ لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەندامەکان هەمان ڕایان نییە.

فەرماندە مافی ئەوەی هەیە لەگەڵ ڕای بەشە زۆرەکەی ئەندامان بێت یان بەشە کەمەکەیان، هەروەها مافی ئەوەی هەیە موخالەفەی ڕای هەموو ئەندامەکانی مەجلیس بکات، بەڕای خۆی کاروبار بەڕێوە ببات، بەڵام لەسەر جەماوەری موسڵمانان پێویستە زۆربە توندی چاودێری ڕەفتارو کرداری فەرماندە بکەن، کاتێ لەگەڵ دانیشتوان دەجوڵێتەوە ئایا لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بە گوێرەی فەرمانی خوا دەجوڵێتەوە، یاخود بە دوای هەواو ئارەزووی خۆی دەکەوێت؟ ئەگەر بینیان بە دوای هەواو ئارەزووی خۆی دەکەوێ، ئەوا بۆیان هەیە لای بدەن لە شوێن و پایەی خۆی و دووری خەنەوە.

پێنجەم: هەر کەسێك خۆی بێنێتە پێشەوەو داوای هەڵبژاردنی خۆی بکا یا لەو ڕێگایە کۆشش بکات، ئەوا نەبۆ فەرماندەیی و نەبۆ ئەندامێتی

مەجلیسی شورا و نەبۆ هیچ پایەك لە پایەکانی لیٚ پرسینەوە هەڵنابژێردرێت، پێغەمبەر (صلّى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:- (إنَّا واللهِ لا نُولِّي هَذا العَملَ أحَداً سألهُ أو حَرِصَ عَليهِ) واتە: (قەسەم بەخوا ئێمە ئەم کارە نادەینە کەسێك داوای بکا یا سور بێ لەسەر وەرگرتنی).

شتێکی ئاشکرایە لە کۆمەڵگای ئیسلامی جێگەی خۆ هەڵبژاردن بۆ پایە و پڕو پاگەندە بۆی هەر نییە!! ئەوەی چێژی ئیسلامی تێك دەداو ژێری ئیسلامیش رەفزی دەکا ئەوەیە بۆ پایەیەك (منصب) یەکێك یان دوو یان سێ یا چوار کەس لە داواکەرانی ئەم پایە هەڵدەستن و هەریەکە کەم و کوڕی ئەوی تر بڵاو دەکاتەوە لە پۆستەرو بڵاوکراوە.. هتد. بە جۆرێك پیاو لە پیاوەتی ڕەخاو ئارەقەی غیرەت و شەرەفی ئیسلامی دەکاتە قەترە ئاوێك، بێجگە لەمەش ئاهەنگ دەگێڕن بۆ پێدا هەڵدان بۆ خۆیان و تانەدان لە غەیری خۆیان. ئێزگە و ڕۆژنامە بۆ خۆیان تەرخان دەکەن بۆ پڕوپاگەندەو درۆو دەلەسە، خاوەن دەنگەکان بە جۆرەها ڕێگەی بێشەرمانە بۆ خۆیان ڕادەکێشن، پارەیان پێ نیشان دەدەن و ئۆتۆمبیلەکانیان دەخەنە کار بۆ لە خشتە بردنی خەڵك و گێل کردنیان. پاشان ئەوەی لەهەموان درۆزنترو فێڵبازترە سەردەکەوێت، یان ئەوەی لە هەموان دەست بڵاوترە بۆ ماڵ بەخشین، جا ئەمانە هەموو ڕێگای نەفرەت لیٚ کراوی دیموکراتییەتی شەیتانین، ئەگەر بینرا یەکێك لە دەوڵەتی ئیسلامی دەیەکی ئەمەی کردووە، ئەوا دەدرێتە دادگا و سزایەکی زۆر سەختی دەرخوارد دەدرێ، چ جای ئەوەی لەمەجلیسی شورای جێ نشینی، هەڵبژێردرێت.

شەشەم: لە ئەنجومەنی راوێژ(مەجلیسی شورا)دا نابێت ئەندامەکانی دابەش بن بۆ کۆمەڵە و دەستەی جیا جیا، بەڵکو دەبێ هەریەکێك ڕای خۆی بە ڕاستی روون کاتەوە، بە سیفەتی تاکی خۆیی وبەس، ئیسلام رازی

نییـه بـەوەی خـەڵکی خـاوەن مەشـورەت پارچـە پارچـە بـن و هەرکـەس لایەنگیری پارت و دەستەی خۆی بێت لە هـەق و ناهـەقدا، بـەڵکو ئـەوەی گیانی ئیسلامی دەی خوازێ ئەوەیە دەبێت مـرۆڤ لەگـەڵ هـەق و راسـتی بن، جا ئەو هەقە لە هەر کوێ بێت، بە هێندی موویێك لێی لانەدەن، ئەگەر هاتوو ئیمرۆ ڕایەکی ڕاستیان بینی دەبێت لـە گـەڵیدا بـن، ئەگـەر هـاتوو بەیانی بینیان ڕای هەمان پیاو لە مەسەلەیەکی تر لەگەڵ ڕاستیدا جیاوازە، دەبێت بەرهەڵستی و بەربەرەکانی ی بکەن.

حەوتـەم: مەجلیسـی دادگـاو فـــەرمانڕەوایی[١] لـــە دەرەوەی ســـنوری پێکهێنراو و دەزگا تەنفیزیەکانن، بەتەواوی، چونکـە قـازی ئیـش و کـاری ئەوەیە یاسای خوایی لە نێوان خەڵکدا جێبەجێ بکات، بۆیە ئـەو کەسـەی کە ئیش و کاری فەرمانڕەوایی وەردەگرێـت لـە دادگـا، جێگـری جێنشـین (خەلیفە) نییە بەڵکو جێگری خوایە، جێ نشـینیش (خلیفـە) لـە دادگـادا وەکو هەر کەسێکی ترە، کەس ناتوانێ خۆی جیاکاتەوە لـە ئامـادە بوونـی مەجلیسی دادگا لەبەرئەوەی کە پیـاوێکی گەورەیـە یـا لـە بنەماڵەیـەکی شەریف و خانەدانە یا لەبەر ئەوەی پلەو پایـەی گـەورەی پـێ دراوە، هـەر کەسێك با ئەو کەسە کرێکار بێت یـا جوتیـار یـا نـەدار (فقـیر) دەتوانـێ کێشەی خۆی لەگەڵ پیاوە گەورەکانی دەوڵەت بۆ مەجلیسی فـەرمانڕەوایی بەرزبکاتەوە، تاکو ئەو کێشەیە لەگەڵ پێشەوای موسڵمانانیش بێت، قـازی دەبێ بە پێی هەق و راستی ئیش بکات و یاسای خوا بـەکاربێنێت لەسـەر جێ نشین، ئەگەر هاتوو لەسەری ئیسپات بوو کە تـاوانی هەیـە، هـەروەکو چۆن فەرمانڕەوا لەسـەر یـەکێکی تـر لـە موسـڵمانان جێبـەجێ دەکـات.

---

[١] - مەجلیسی دادگاو فەرمانڕەوایی : مجلس القضاء و الحكم

هەروەها ئەگەر خەلیفەش (جێنشین) سـكالآی هـەبوو لەسـەر یـەكێك كـە پەیوەندی بەخۆیەوە بوو، نابێت ئاگری تـین و تـوڕەی خـۆی بـەكار بێنێـت لەگەڵ ئـەو كەسـەی لیَ ی بـێزارەو سـكالآی لەسـەر كـردووە، بـەو هـێزو دەسەلآتەی كە هەیەتی، بەڵكو خۆی ناچارە لە ڕووی شـەرعەوە كێشـەكەی خۆی وەكو هەریەكێكی تر لە موسڵمانان بۆ دادگا بەرزكاتەوە.

## کۆتایی

لەم موحازەرەیە کورتە ناتوانم بە درێژی باس لە خاسیەتەکانی دەوڵـەتی ئیسلامی لە هەموو ڕووەکانییـەوە بکـەم، چونکـە نـاتوانرێت لـە کرۆکـی دەولّتی ئیسلامی یەوە بکوڵینەوە هەتا تـەواو لـە ڕووداوەکـانی دەوڵـەتی ئیسلامی لـە سـەردەمی پێغەمبـەر (صلّـی الله علیـه وسـلم) و خەلیفـە راشیدەکان نەگەین. جێ ی داخە کەمی کات[1] بۆتە بەرەبەستێك لە درێـژە دان بەم باسە و وای لیّ کردووم بە کورتی باسی بکەم، تێکرا من وا دەبینـم لەوەی ڕوونم کردەوە بەس بێت بۆ نیشاندانی وێنەیەکی روون و ئاشـکرا بـۆ شێوەی دەوڵەتی ئیسلامی و پەیڕەوەکەی.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

---

[1] ئەسڵی ئەم نامەیە موحازەرەیەك بوو هەروەکو لە پێشەکی دا هاتووە.

# ناوەرۆك

